تصویر ابو عبد الرحمن الكردي
ئەحمەد هەردی
( ئەحمەد حەسەن عەزیز )
ڕازی تەنیایی
٢٨
شیعر
چاپی دووەم
١٩٨٤
لەسەرئەرکی
کتێبخانەی سلێمانی چاپی کردووە و بڵاوی کردۆتەوە
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
للكتب ( كوردى ,عربي ,فارسي )

# ڕازی تەنیایی

## شـــیعر

**چـاپــی دووەم ١٩٨٤**

لەسەر ئەرکی کتێبخانەی سلێمانی چاپکراوە

لە بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین لەچاپدراوە

## پێشەکی چاپی دووەم

لەو ڕۆژەوەی (ڕازی تـەنیایی) بـۆ یەکەمجار ، لـەساڵی (١٩٥٧)دا چاپکراوە ، هەندێك لەشیعرەکانی بوونەتـە مایەی گفتوگۆو لێدوانو لەسەرنووسینی هەندێ برادەری نووسەر ، کە داخەکەم هەریەکەیان لەخۆیەوە کاتو مەبەستی بـۆ شیعرەکانم داناوە ، یان بەئارەزووی خۆی لێکیداونەتەوە · لەناو ئەمانەدا ، دووانیان ، یان بڵێین نووسینی دووانیان ، بایەخێکی تایبەتی‌یان هەیە : یەکەمیان هاوڕێی بەڕێزم (د· عیززەدین مستەفا)یە کە لـەکتێبی ( الواقعیـة في الأدب الکـردي ) دا کـە دکتـۆرانامەی مامۆستای ناوبراوە، لەچەند شوێنێکدا باسی شیعرەکانم ئەکات·

دووەمیـان : ووتارێکـە کـە (کاکەی فـەللاح) لـەڕۆژی ( ١٩٧٧/٨/١ ) دا لەباخچەی یەکێتی نووسـەرانی سـلێمانی ، دەربارەی من دابـوی ، و لـەدواییدا ( سـاڵی ١٩٧٨ ) ، ئـەو ووتارەی لـەگەڵ چـەند ووتـارو نـووسینێکی تـردا بـەناوی (کاروانی شیعری نوێی کوردی[١])یەوە لەچاپداو بڵاوی‌کردەوە·

هەرچی نووسینەکەی (کاکەی فەللاح)ە ، باسێکی تاڕادەیەك دوورو درێژە[٢]و ، لەپاڵ شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی ئـەدەبیدا ،

چەند هێرشێکی نارەواو گەلێ قسەی ڕەقو ناشایستەی تێدایە ، وەك ویستبێتی ناوی من لەکەداربکات ، لەکاتێکدا کە مـن نـەك هەر لەم وولاتە نەبووم ، بەڵکو هەواڵی مردنیشم لـەم (دەمەوە) ئەڕۆیشت بۆ ئەو دەم .

ئەوی ڕاستی بێت کاتێك کەویستم (ڕازی تەنیایی) بۆ جاری دووەم چـاپبکەمەوە ، لـەپێشدا بـڕیارم وابوو کـە وەڵامێکی دوورو درێـژی هەردوو نووسینەکەی (د. عیززەدین)و (کاکەی فەللاح) بـدەمەوە ، لەمڕووەوە ، زۆرتریش قسـەی برادەرێك کاری تێکردم کە ووتی : «ئـەگەر سبەینێ خـۆت مردیت ، کێ لەدوای خۆت ئەتوانێ لەجیاتی تـۆ وەڵامبداتەوە[٢] ؟ ، تەنانەت ئـەگەر کەسێکی واشـں هەبێت ، کێ بـڕوای پێ ئـەکات ؟ یـان خوانەخواستە ، دوای مردنی ئـەوان ، ئـایا وەڵامدانەوەی تـۆ ، نابێتە هۆی ئەوەی خەڵکی بڵێن : هەتا نەمردن نەیوێرا وەڵامیان بداتەوە ! چونکە ئەوەندەیان بەڵگە بەدەستەوەبوو ، کە لەژیانی خـۆیاندا ، نـەوێرێت سـەرپێچی یان لەگەڵدابکات !» ، ئـەڵێم لەڕاستیدا ئـەم قسـەیە کاری تێکردمو ، دەستم دایە قـەڵەمو وەڵامێکی دوورو درێژم نووسی ، بەو هیوایەی بیکەم بەپێشەکی ئـەم چاپی دووەمە ، بـەڵام پاش ماندووبوونو نووسینێکی زۆر ، بۆم دەرکەوت : کە نووسینێکی وا دووروودرێژ ، نەك هەر لێرەدا جێی نابێتەوە بـەڵکو پێویستی بـە نـامیلکەیەکی سـەربەخۆی سەروەرە . ئـەگەرچی تەنانەت لەوێشدا ڕەنگە هـەر دەرفەتی

ئـەوەم نەبێت کە : سەرتاخواری قســەکانی (کاکەی فــەللاح) شی‌بکــەمەوە • جــا لــەبەرئــەوە بــڕیارم دا : ئــەو وەڵامــە لەنامیلکەیەکی تایبەتیدا بنووسم‌و ، لەدەرفەتێکدا چاپی‌بکەم • بەڵام ئەوەی لێرەدا پێویستە دەست‌نیشانی بکەم ، چەند خاڵێکی سەرەکی‌یە ، کە : بەشێوەیەکی گشتی ، هەندێك لەشیعرەکانم‌و چــەند سوچێکی ژیــانی خــۆم ، تاڕادەیەك ، ڕوناك‌ئەکاتەوەو لە هەمان‌کاتدا وەڵامێکی ســەرەتایی‌یە بــۆ قســە نــاڕەواکانی (کاکەی فەللاح) ، کەهەر لەســەرەتاوە وای پیشان‌ئەدات ، مــن لەشاعیری کەوتوومو قسەکەش ئەداتە پــاڵ خــۆم(٤) • لەپاشاندا ئــەم بۆچوونەی خــۆی ، بــەچەند شێوەیەك دوبارەئەکاتەوە • بۆنمونە کەدێتە سەر ئەم سێ بەیتە :

( بەڵێ ئەوسا دڵێکم بوو کــە سەرچاوەی ژیانم بــوو
دڵێ مەلبەندی ئاواتو تــەوژم‌و تینی گیــانم بــوو
دڵێ گوڵزاری دڵداری‌و بەهەشتی خۆشەویستی بــوو
وەکو بتخانە مــەیدانی بتی جــوانی پەرستی بــوو
لــەگەڵ هاوارو گریانی(*) هــەژارانا لــەشینا بــوو
لەگەڵ ناڵەی کەساساندا لەخوڕپەو ڕاچەنینا بــوو )

ئــەڵێم کەدێتە سەر ئــەم سێ بەیتە کەبەشی دوایی شیعری ( دڵێکی تێکشکاو )ەو لەکاتی خۆیدا نەمتوانیوە تەواوی‌بکەم ، (کاکەی فەللاح) ئەڵێت : ( لێرەدا لەپڕ وەستاو شیعرەکەی بەبێ ئەنجام‌و ناکامڵ بەجێ‌هێشتو نەیویست ، یا ڕاست‌تر نەیتوانی

**بگـاتە کۆتاییی‌یەکی سەرکەوتوانەو تەواو[٦] ٠) ، وادیارە هـەر**
تـەنیا ( کاکەی فەللاح ) بـڕوای وا نـەبووە ، بـەڵکو هەندێك
بـرادەری تریش لەو بڕوایەدابوون کەمـن ناتوانم ئـەم شیعرە
بـەهەمان سۆزو گەرم‌وگوڕی‌یەوە تـەواوبکەم ، لەمانە مامۆستا
( عومەر عارف[٧] ) کە هاوڕێ‌یەکی دێرینمە ، لەهەموویان زۆرتر
ئەم قسەیەی ئەکردەوەو ، نەك هەر ئەوەش ، بەڵکو گرەوێکیشی
لەسەرکردو بەڵێنی‌دا کە سەیرانێکی گەورە بۆ دەستەیەکی زۆر
لـەو بـرادەرانە ســازبکات ، بـەومەرجەی مـن ئـەو شیعرە
تەواوبکەم[٨] ٠ بـەڵام لێـرەدا جیاوازی‌یەکی بنـەڕەتی هـەیە
لەنێوان قسەی کاك (عومەر عارف)و قسەکەی(کاکەی فەللاح)دا،
ئەویش ئەوەیە کە هەرچی کاك (عومەر)و هاوڕێکانین ، بڕوایان
وابـوو کـە شیعرێك لە (١٩٤٦)دا ووترابێت ، لە (١٩٨٣)دا
تەواوناکرێت[٩] ، بـەڵام مـن بەتەواوکردنی شـیعرەکە توانیم
بیسەلمێنم کە ئەم باری سەرنجە ڕاستنی‌یە ٠

بێینەوە سەر بـیروڕای (کاکەی فەللاح) ، ووتمان بـڕوای
مامۆستا (فەللاح) لەگەڵ بڕوای کاك (عومەر)دا زۆر جیاوازە ،
چونکە ئەگەر ئەم لەبەر چەند هۆیەك تەواوکردنی ئەو شیعرەی
بەگران زانیبێت ، (کاکەی فەللاح) نەك هەر ئەو شیعرە ، بەڵکو
بڕوای وایە کـە گـوایە جـارێکی‌تر ناتوانم هیچ شیعرێکی وا
**بەسـۆز بڵێـم ، ئـەوەتا ئەڵێت : (٠٠٠ لەبەرئەوەش کـە بـە
تاقی‌کردنەوە بـۆی دەرکەوت کـە ناتوانێت شیعرێکی هاو بیرو
هاوسۆزو بەهرەدارانەی وەك ئەوانەی پێشوو بڵێت ، مەسلەحەت**

**وایە بێدەنگ بێت۰۰۰هۆیەکانو زامەکانیش زۆر لەوە قووڵترو بەسوێترن کـە ووشکەگلەیی‌و تاسەی سەرپێیی ئەموئەو کـار لە شاعیر بکاتو بجوڵێت(١٠)۰**

وەك ئەبینین (کاکەی فەللاح) ، زۆر بـە دڵنیایی‌یەوە وای پیشان ئەدات کە من جارێکی‌تر ناتوانم شیعرێکی وەك هی جاران بڵێم ، جگە لەمانە گەلێ قسـەی تریش ئەکات کـە لێـرەدا جێی باسکردنیان نی‌یە ۰

★ ★ ★

وەك لەنوسینەکەی (کاکەی فەللاح)و ئەوانی‌تردا دەرئەکەوێت ، ئەو نووسەرانەی باسی ئەو قۆناخانە ئەکەن کە شیعری منی پێدا

**تێپەڕیوە دووخاڵ هەیە نایزانن :ـ**

یەکەم : ئەوە نازانن کە لەسەرەتای ژیانی ئەدەبیمەوە ، جگە لـە سەردەمێکی کورت ، قوتابخانەی (ڕۆمانسی) کاری تێ‌کـردوم ، پێش ئەوەی هیچ ئەدەبێکی (ڕیالیزمی) ببینم ، هەروەها ئـەوە نازانن : کاتێك کەچومە مەیـدانی سیاسەتەوە ، مـن لەقۆناخی خۆشەویستی دووەمیش تێپەڕیبوم ، ئەگـەرچی کـارتێ‌کردنو شوێنەواری تاچەند ساڵێکی تریش هـەر مابوو ۰ بەپێچەوانەی ئەوەوە کە (کاکەی فەللاح) ئەڵێت : (شاعیر لەدنیایەکی ریالیزمی سەرقاڵی کاروباری بیروباوەڕی سیاسی‌و۰۰جموجوڵی ڕۆژانەوە، ڕوی‌کردە مەڵبەندی ـۆزی ڕۆمانسی‌یانەو بەزمی دڵداری(١١))۰۰ واتە بەپێچەوانەوە من لەدنیایەکی پڕ جۆش‌و خرۆشی دڵـداری‌و

سۆزی ڕۆمانسی‌یەوە ڕومکردوەتە مەیدانی سیاسەت ٠
**بۆیە ئەبینیت لەسەرەتادا شیعری پڕ سۆزی ڕۆمانسی‌و لەدواییدا شان‌بەشانی ئەو ، بابەتی ڕیالیزمی لەشیعرەکانمدا دیارن ٠**
بەڵام نابێ ئەوەمان لەبیربچێت کە قوتابخانەی ڕۆمانسی خۆی لە خۆیدا(دوو ڕێڕەوی جیاوازی تێدایە کە ئەتوانین ڕێڕەوێکیان ناوبنێین ڕێڕەوێکی ڕۆمانسی ڕووت یان ـ سەلبی ـ و ڕێڕەوێکی ئیجابی(١٢) ٠٠٠) ٠

کەئەمی دووەمیان (پاڵ بەمرۆڤەوە ئەنێت ویستی خۆی لەژیاندا بسەپێنێ‌و گیانی بەربەرەکانی تێدا دروست‌ئەکات دژی نالەباری‌و ژیان‌و ئەو کۆتانەی بەزۆر ئەکرێنە پێی(١٣)) ٠

من لەسەرەتادا ڕێڕەوی یەکەم‌و لەپاشتردا هەردوو ڕێڕەوەکە لەشیعرەکانمدا دیارن وەك لەپێشدا ووتم‌و ، تا ماوەیەکی زۆر هەردوو ڕێڕەوەکە شان‌بەشانی یەکتر ڕۆیشتون ، ئەمەش شتێکی سەیر نی‌یە کە ڕێڕەوێکی ئەدەبی ئەوەندە کاربکاتە سەر دڵ‌و دەرونی مرۆڤێکی شاعیر یا هونەرمەندو شان‌بەشانی ڕێڕەوێکی‌تر ، تا ماوەیەکی زۆر لەژیانیدا بڕۆن بەڕێوە ، چونکە ژیانی دەروونی‌و هەست‌و سۆزو ناخ‌و هۆشی مرۆڤ ، ئەوەندە سادە نی‌یە ، یان ژورێکی سادەی دوو دەرگا نی‌یە ، لەم‌سەرەوە تەوژمێکی(١٤) تێ‌بکەیت ، لەوسەری‌بچێتەدەرەوە ! بەڵکو هەر شەپۆلێك ، یان تەوژمێکی بیروڕا ، یان تەوژمێکی سۆزو خۆشەویستی‌و هونەر ، کە چوە

دەروونو ناخی هەستەوەو ، ڕەگی داکوتا ، هــەروا بەئاسانی ، شوێن بۆ تەوژمێکی نوێ بەجێ ناهێڵێ ، بەڵکو لەتەکیدا ئەکەوێتە زۆرانبازی ، بگــرە لەوانەیە تــا ماوەیەکی زۆر هــەردووکیان شوێنەواریان لەدڵو دەروونندا دیاربێت ، تا لەدواییدا ، یەکێکیان سەرئەکەوێت ٠

گومانی تێدا نی یە، منیش وازم لەشیعر نەهێنایە، یەکێك لەو ڕێڕەوانە(یان ئەو تەوژمانە)بەسەر شیعرەکانمدا زاڵئەبوو٠٠، وەمن لاموایە ڕێــڕەوی دووەم ، واتــە : ڕێــڕەوێکی (ئیجابی) شۆڕشگێڕانەم ئەگرت ، چونکە بەڕاستی لەساڵی ١٩٥٧ دا خۆم هاتبوومە سەر ئەوبڕەو بۆئەوەی خوێنەرانی (ڕازی تــەنیایی) ئــەو تــەمومژی نائومێدیو ئــاوازە گــریاناوی یەی شیعرەکان کاریان تێ نەکەن ، ئەوەبوو لەسەرەتای چاپی یەکەمدا ووتبــوم **(٠٠٠ حەزناکەم ، بەمن بێت ، گوێی هیچ گەنجێکی کورد بــەو چــەشنە ئاوازانە بئاخنرێ کــە سەرتاپا بــۆ ئافــرەتو دلداری ئەلاوێنێتەوە[**]** ) ٠ بــەلام داخەکەم زۆربەی ئــەو نووسەرانە ، یان لەم قسانە تێ نەگەیشتوون ، یان زۆرچاك تێ ی گەیشتوونو خۆیانی لێ هەڵئەکەن ٠ لەناو هەموو ئەو کەسانەدا کە لە (ڕازی تەنیایی) دواون، تەنیا لاوێکم دیوە کە تاڕادەیەکی زۆر لەو چەند دێڕە تێ گەیشتبێت ، ئەویش شاعیری لاو کاك (ئەنوەر قادر)ە ٠ بەهەرحاڵ با بێینەوە سەر خاڵی دووەم ٠

دووەم : ئــەو نووسەرو ڕەخنەگرانە ، هــەتا ئێستا نازانن

شیعرەکانی مــن هەریەکەیان کــەیو بۆچی ووتراونو کــامیان پێش کامیان کەوتوون • لەبەرئەوە زۆر جار لەگۆتره شیعرێك کە لەسەرەتای ژیانی هەرزەکاریمدا ووتراوە ، ئەوان ، بەهی ســەردەمێکی تری دائەنێنو بەئارەزوی خۆیان مەبەستیشی بــۆ دائــەنێن داخــەکەم لێرەدا بواری ئــەوەم نی‌یە لەیەك بــەیەکی شیعرەکــانم بدوێم ، لەبەرئەوە هــەڵی‌ئەگرم بــۆ نامیلکەیەکی تــایبەتی ، بــەڵام بەهــەلی ئەزانم کــە لەبــەشی دووەمی ئــەم پێشەکی‌یەدا بــەپێی پێویست باسی هەندێکیان بکەمو مێــژوی هەریەکەیان ناونووس‌بکەم •

پێش‌ئەوەی باسی ئــەم چــاپە تازەیە بکــەین ، بــا باسێکی چاپی یەکەم بکەین ، کە لەساڵی (١٩٥٧)دا چاپکراوە(١٧) •

لەکــاتی خۆیداو لەچــەند ماوەیــەکی دوور لەیــەکتردا ، زۆربەی شیعرەکانی (ڕازی تەنیایی)م ، بۆ هاوڕێی خۆشەویست (کاك مەحمود تۆفیق(١٨)) بەخەتی خۆم نوسیبو ، لەسەر داخوازی خۆی • لەدەوروبەری (١٩٥٧)دا ڕۆژێك کاك (مەحمود تۆفیق)م توش‌بوو لەیەکێك لەشەقامەکانی سلێمانیدا مامۆستا (مــەعروف خەزنــەدار)ی لەگەڵــدابوو ، کە ئەویشــ یەکێکە لەو هــاوڕێ بەڕێزانەی لەکۆنەوە ئەمناسین ، وابــزانم (جەمــال خەزنەدار) یشــیان لــەگەڵدابــوو ، پــاشــ وەســتانو چــاکی‌و چــۆنی ، کاك (مــەعروف) کە ئەوســا هێشتا دکتــۆرای وەرنەگرتبوو ، ڕوی‌تێ‌کــردمو ووتــی : (ئێمە بڕیــارمــانداوە شیعرەکــانت

چاپبکەین) •

هەرچەندە لەسەرەتاوە من ڕازی نەبووم و ووتم من شیعرم نی یەو ناتانـدەمێ ، بـەڵام کە ئەوان دەستنوسەکەی خـۆمیان پیشاندام کە بۆ (کاك مەحمود)م نوسیبوو ، ناچاربوم بڵێم باشە بـەڵام پێم ووتن زۆری ئـەم شیعرانە ناتەواون و چـاپکردنیان شتێکی ڕاست نی یە ، کەچی (کاك مەعـروف) بڕوای وابوو کـە تەنانەت لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان ناتەواون ، هـەر تینوێتی خەڵك ئەشکێنن ، چونکە تاڕاددەیەك مەبەستیان داوە بەدەستەوە• لاموابێ زۆرتر مەبەستی ئەوەبوو ناچـارم بکات تەواویان بکەم ، بەهەرحاڵ لەساڵی (١٩٥٧) دا، چاپکراو لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ شیعری تـرم هـەبوو کـە لـەو چاپـەدا نەنووسراوە ، وەك :

(١) شیعری (فەلسـەفەی دڵـداری) : کـە یـەکێکە لـەشـیعرە جوانەکانی (شیلی)و من لەکاتی خۆیدا لەگۆڤاری (المجلة)ی ( عبدالحق فاضل )ەوە وەرمگێڕابووە سەر کوردیی و لەساڵی (١٩٣٩)دا لـە (١٤ی ئـەیلول) لـەڕۆژنـامەی (ژیـن)دا بڵاوکراوەتەوە ، هەروەها لەپاشا لەژمارە (٣ـ٤)ی گۆڤاری (گـەلاوێژ)ی سـاڵی (١٩٤٢)دا بـڵاوکراوەتەوە ، بـەڵام ناوەکەی گۆڕاوە بە (فەلسەفەی دڵداران(١١)) •

(٢) شیعری (بێ ئارامی) : ئەمیش هەرچەند شیعرێکی کەمە بەڵام وێنەی بێ ئـارامی یەکی دەوری هـەرزەکاری ئەکێشێ کـە لـەنێوان (١٩٣٨ـ١٩٣٩)دا نوسراوەو هـاوڕێیەکی وەك

کاك (عومەر عارف) نەیێت کەسی‌تر لەمنی نەبیستوە ٠

(٣) شیعری (پەیامی یار) ، یان (لەیارەوە) : ئەم شیعرەش هەر لەچاپی یەکەمدا نی‌یە ، چونکە دوای چاپی یەکەم وو‌تراوە ٠ لەبیرمدێ لەکاتی خـۆیدا ، واتە لەحوزەیرانی (١٩٥٨)دا هـاوڕێی هـونەرمەند (قـادر دیلان) داوای‌لێ‌کـردم کـە شیعرێکی بۆ دابنێم بۆ ئاوازی گۆرانی بشێت ، منیش ئەمەم بـۆ داناوە کە بـۆ یەکەمجار لـەهۆڵی کتێبخانەی گشتی ، (عـومەر ڕەزا) بـەئاوازەکەی (قـادر دیلان)ەوە ووتی ، بـەبۆنەی چیرۆکێکی شانۆگەری‌یەوە کە هاوڕێی بـەڕێزم کاك (مستەفا سالح کەریم)(٢٠) داینابوو ٠

(٤) شیعرێکی عـەرەبیم هـەیە بـەناونیشانی (صلوات المحب)و لاموایێ ئەمە دووەم جارە شیعر بەعەرەبی بڵێم ، یەکەمیان هێشتا قوتابی بووم لە(مامۆستایان)، لەئەنجامی گرەوێکدا نووسیم ، داخەکەم ئێستا هەر چوار دێڕی یەکەمم بیرماوە ٠ بەهەرحاڵ ، بێینە سەر باسی (صلوات المحب) ، لەو ساڵەدا کـە لاموایێ (١٩٥١)بوو گـۆڤارێکی ئێستگەی ڕادیـوی لبنانیم دەستکەوت ، وابزانم (هنـا بـیروت)ی ناوبوو ٠ زۆرتر لەبەرئەوە کڕیم شیعرێکی عەرەبی تێدابوو کە ئێستا لەبیرمنەماوە ڕەنگە (قطرات ثلاث)ی (ئەحمەد سافی) بێ ٠ هەروا چـاوم بەگۆڤارەکەدا ئـەگێڕا ، (گرەوێکی شیعری) تێـدابوو بـۆ شاعیران ، کە هەرکەسێك بتوانێت شیعرێکی

دلداری بنێرێت بۆ ڕادیۆی بێروت‌و لیژنەی تایبەتی ئێستگە پەسەندی‌بکات ، خەڵات‌ئەکرێت‌و سێ خەڵاتی بـۆ دانرابوو وە یـەکێك لەمەرجەکانی ئەوەبوو (١٠) شیعر لـەوانەی، لیژنەکە پەسەندی‌ئەکات ئاوازی بـۆ دابنرێت‌و ببێتە ماڵی ئێستگەو مەرجێکی تریشی ئەوەبوو کـە شیعرەکە لەدوانزە بەیت پترنەبێت ، ئەوە بووەهۆی ئەوەی ئەو شیعرە دابنێم ، بەڵام کەگەڕامەوە بـۆ گۆڤارەکە تاکو ناونیشانی تەواوی ئێستگەکە بـزانم ئـەم مەرجەی تـرم دی کەنووسـرابو : (تـەنها شاعیرانی لبنان ئـەتوانن لـەم گرەوە شیعری‌یەدا بەشدارین) ، لەبەرئەوە نەمنارد ، هـەرچەندە لەدواییشدا بیرم گۆڕی بەڵام تازە کاتی خۆی تێپەڕیبوو ٠

ئینجا بـاییینە سـەر باسی ئـەو سێ شیعرەی کـە لەچاپی یەکەمدا بەناتەواوی مابوونەوەو لەساڵی(١٩٨٣)دا تەواوکران٠

ئـەم سێ شیعرە هـەرچەندە چـەند قسەیەکیان لێ‌کراوەو قسەکان هیچیان مەبەستیان نەپێکاوە ، واتە ئەوانەی باسی ئـەم شیعرانەیان‌کردوە ، لەخۆیانەوە لێ‌ی‌دواون ، لـەگەڵ ئـەوەشدا خۆشـم حـەزم‌کردوە تەواویان‌بکەم ، نـەك هـەر لەبەرئەوەی ناڕاستی قسەو بۆچونەکانی ئـەوانە بەخوێندەواران بسەلمێنم ، بـەلکو لەبەرئەوەی کـە بەڵێنیشم دابـوو هەرچۆنێك بێت ئـەم شیعرانە تەواوبکەم ٠ ئەوسا (کاکەی فەللاح) لەساڵی (١٩٧٧)دا ووتارەکەی دابـوو(١) ، وەکـو ووتـم مـن لـەم ناوەنەبووم‌و نەشم‌ئەزانی کە تەواونەکردنی ئەو شیعرانەو بێ‌دەنگی ئەم چەند

ساڵەم بەجۆرێکی تـایبەتی لێکدراوەتەوەو کراوە بـەبەڵگەیەك بۆئەوەی کە من هەرگیز ناتوانم شیعربڵێم • بەڵام کە هاتمەوەو ئەمقسانەم خوێندەوە ، بڕیارمدا کـە ئەمشیعرانە تەواوبکەم ، بـا زۆر لەسەری نەڕۆینو بێینە سەر شیعرەکان :

(١) شیعری (دڵداری کچی تازە) کە لەبنەڕەتا ناوی (دووچەشن دڵـداری)یـە :

(کاکەی فەللاح) کەباسی ئـەم شیعرە ئەکات ، کە ئـەڵێت :

**(ئەم دڵەی وەك بتپەرستێ ڕوو ئەکاتە چاوەکەت**
**(نوێژئەکا بۆ تیشکی چاوو زوڵفە تێکئاڵاوەکەت•••هتد)**

**وائەزانێت کـە شیعرەکە (هـەمان چیرۆکی خۆشەویستی[٢٢] )ی منـەو گـوایا ( بـەچکە دەوڵەمەنـدێك[٢٣] ) خـۆشەویستەکەی (لێزەوتکـردوم[٢٤] ) ، کـە ئـەمانە هـەرسێکیان ڕاستنـینو**
بەڵگەیەکن بۆئەوەی مامۆستا ئاگاداری باسەکە نییەو لەخۆیەوە قسەئەکات • بۆئەوەی خوێندەواری خۆشەویست ئاگاداربێت ، ئـەڵێم : لەسـاڵی (١٩٥٠)دا لـەئەنجامی چـەند گـفتوگـۆو قسـەگـۆڕینەوەو لێدوانێکـی دوورو درێـژی ئەوسـادا ، وام بەبیرداهات کەچەند شیعرێکی دڵداری ڕێكبخەم کە لەناوەرۆکدا جیاوازی چینایەتی پیشانبدات ، بەڵام بەجۆرێك بێت کە لەگەڵ زەمینەی گشـتیی شیعرەکەدا بگـونجێت ، نـەك بـیروڕایەکی ناسازێتو بەزۆر ئاخنرابێتە ناو شیعرەکەوە • لەمڕووەوە هەر دووشیعرم پێووترا ، یەکەمیان شیعری (ست فاتمە)بوو ، ئەوی

تریان (دڵداری کچی‌تازه)بوو که له‌بنه‌ڕه‌تدا نـاوی (دووچه‌شن دڵـداری)یه ٠

به‌ڵام شیعری (ست‌فاتمه) وه‌ك له‌پاشدا باسی‌ئه‌که‌م ، یـه‌ك دوو هۆی تریش هه‌بوو بۆدانانی ، بـه‌ڵام ئـه‌وی گـرنگه لێره‌دا ئه‌وه‌یه : ئه‌و په‌لاماردانی(خـاوه‌ن‌ته‌لارو عـانه)یه‌ی لـه‌شیعری ست‌فاتمه‌دا هه‌یه له‌ڕاستیدا زیاتر ئه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌و پڕۆژه‌یه‌ی که‌ووتم ، نـه‌ك بـۆ جیاوازی چینـایه‌تی نێوان من‌و ئـه‌وکچه‌ی له‌وێدا ناونراوه (ست‌فاتمه) ٠ لێره‌دا مه‌به‌ستم ئه‌وه‌نی‌یه که ئه‌و جیاوازی‌یه نه‌بوو، چونکه له‌ڕاستیدا ئه‌وکاته من بێ‌ئیش بووم ، **به‌ڵکو مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه ئه‌گه‌ر ئه‌و کچه زۆر هه‌ژاریش بوایه من هه‌روام پیشان‌ئه‌دا که له‌چینێکی له‌خۆم به‌رزتره ، چـونکه وه‌ك له‌پێشدا ووتم مه‌به‌سته‌که ده‌رخستنی جیاوازی چینـایه‌تی بـوو له‌شیعرێکی دڵداریدا ٠**

بێینه‌وه سه‌ر باسی(دووچه‌شن دڵداری)یه‌که‌ی له‌مه‌ڕخۆمان ، سه‌رکه‌وتنم له‌شیعری (ست‌فاتمه)دا ، هانی‌دام که شیعرێکی تـر دابنێم سـه‌رومڕ بـۆ ئـه‌ومه‌به‌سته تـه‌رخان‌کرابێت کـه‌ووتم ، بـۆئه‌مه‌شیان چـیرۆکێکم به‌بـیرداهات کـه زۆرجـار لـه‌ژیانی کۆمه‌ڵایه‌تیدا ڕوئه‌دات ، ئـه‌ویش ئه‌وه‌یه ، کوڕێك کـه له‌پله‌ی کۆمه‌ڵایه‌تیدا هاوچینی کچێکه یـان که‌مێك خوارتره له‌و ، حـه‌ز له‌کچـه ئه‌کات‌و به‌ته‌مایه بیهێنێ ، بـه‌ڵام کچه‌که حـه‌ز له‌وکوڕه ده‌وڵه‌مه‌نده ئه‌کات کـه بـه‌خۆی‌و کادیلاکه‌که‌یه‌وه ده‌وروخـولی

کچەئەدات ، بەڵام نەك بۆئەوەی بیهێنێت ، بەڵکو بۆئەوەی وەك پیشەی خۆی لەگەڵیدا ڕابوێرێتو پاشان وەك گوڵی سەرمێزەکەی بەمیسو ژاکاوی فڕێیبدات • بەکورتی چیرۆکەکە بریتیییە لەوەی کە باسمانکرد ، لەبەرئەوە خۆم خستە شوێنی کوڕە هەژارەکە ، کەووتمان لەپلەی کۆمەڵایەتیدا هاوچینی کچەکە ، یان کەمێك خوارترەو ئەو قسانەم پێووتوە کە لەم چاپە تازەیەدا ئەیخوێننەوەو کورتەکەی ئەوەیە بەکچەکە ئەڵێم : هەرچەندە کەتۆ بەتەمای ئەوکوڕەیت بەڵام ئەو ناتهێنێتو وەك گوڵی سەرمێزەکەی سەیرتئەکاتو هەر کە لێتتێرو بێزاربوو فڕێتئەداتە سەرەنوێلکان •

قسەکانیش هەموی لەدەوری یەكشت ئەسوورێتەوە کە **ئەویش ئەوەیە لەخۆشەویستی دوو کەسی جیاوازدا خۆشەویستی دوو چینی جیاواز پیشانبدات ، چینێك ئافرەت بەهۆی ڕابواردن ئەزانێتو چینێك کە بەهاوڕێی ژیانیئەزانێت سەرکەوتنو سەرنەکەوتنیشم باسێکیترە ڕوناکبیران ئەکەم بەسەرپشك •**

(٢) (دڵێکی تێکشکاو) : ئەم شیعرە کە لەچاپی یەکەمدا ناوی (نائومێدی)یەو بەم بەیتە دەستپێئەکات :

**( بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بلندی گەنجی وەستاووم**
**شریتی عومری ڕابوردوو وەکو خەو دێتەبەرچاوم•••هتد )**

ساڵی ١٩٤٦ دانراوەو لێرەدا بەتەواوکراوی پێشکەشی

خوێندەوارانی ئەکەم کە لەنیسانی (١٩٨٣)دا تەواوم کردوە ، واتە دوایَ نزیکەیَ (٣٧) ساڵ .

ئەم شیعرە بەسەرهاتێکی دڵداری‌یەو هیچی‌تر ، تەنانەت لەکاتی خۆیدا بوو بەهۆی مقۆمقۆو قسەلێ‌کردنی برادەرانی ئەوسا ، لەورووەوە کە کەسێك خاوەنی بیروڕایەکی پێشکەوتنخوازبێت ، نابیَ شیعریَ گریاناویَو پڕ لەنائومێدیَ بڵێتو ، هاوڕێی بەڕێزم کاك ( عومەر عارف )و گەلێکی‌تر لەبرادەرانی ئەو دەورە ، ئاگاداریَ ئەمەن .

**بۆیە هەرکەسێك بیەوێت لەمشیعرە بەئارەزوی خۆی ئەنجام دەربهێنێتو یان بیکات بەبەڵگەیەك بۆ مەبەستێکی سیاسی ، تەنیا نەشارەزایی خۆی بەرامبەر بەمشیعرە ئەسەلمێنێتو هیچی تر .**

ئێستا کەشیعرەکە لە (٧)بەیتەوە بووە بە (٣٣)بەیت ، پێشکەشی ڕوناکبیرانی خۆشەویستی کوردی ئەکەمو هیوام‌وایە هەمان چێژو تامی (٧)بەیتەکەیَ پێشووی لێ‌وەرگرن ، هەروەك پێشکەشی ئەوانەشی ئەکەم کەبڕوایان وابوو من جارێکی‌تر ناتوانم ئەم شیعرە تەواوبکەم .

(٣) شیعریَ (تەپڵی بەتاڵ) :

(کاکەیَ فەللاح)شیعریَ (تەپڵی بەتاڵ) بەمجۆرە پێشکەش ئەکاتو ئەڵێت : (**بۆئەوەی باشتر لەحاڵەتە بیروو دەرونی‌یەکەیَ شاعیر بگەین ، حەزدەکەم گوێ‌یەك لەتەپڵی بەتاڵ بگرین**[**]...) بەمجۆرە (کاکەیَ فەللاح)شیعرەکە

پێشکەش ئەکات کە لەچاپی یەکەمدا هەموی (١٠) نیوەبەیتە :

**( وەمزانی کەناموس‌و حەیا نرخی کوڕانە**
**ڕاستگۆیی‌و وولاتپەروەری ئەنجامی ژیانە[٢٦] ٠٠٠)**

لەپاشدا (کاکەی فەللاح) کە ئەمە ئەنووسێت ، ئەڵێت :

**( کەواتە بەپێودانی بڕوای ئەم شیعرە ، ناموس‌و حەیاو ڕاستگۆیی‌و وولاتپەروەری سووکن ، ناوێکی زلن وەك تەپلی بەتاڵ ، بەدەنگ گەورەو بەناو بۆشن[٢٧] ٠ )**

لێرەدا هەرئەوەندە ئەڵێم کەتەنانەت ئەگەر شیعرەکەشم بەوجۆرەی ئێستا تەواونەکردایەو ، ناوەڕۆکەی شیعرەکە هەر لەسەر تەوس‌و توانج بڕۆشتایە ، لاموایە لەتیروتوانجەکانی سەدەها شاعیری‌تر ، تیژتر نەبوو ، کە لەمبارەیەوە ووتویانە ٠ بەهەرحاڵ ئەگەر (کاکەی فەللاح) هەربەوەوە بوەستایە ، ئەمانووت شیعرەکە بەئارەزوی خۆی لێك ئەداتەوەو ، یاهەرئەوەندەی تێگەییشتوە ، بەڵام (کاکەی فەللاح) بەوەوە نەوەستاوە ، ئەوەتا دوای یەكدوو دێڕەکەی پێشوو ئەڵێت : «ئەمە هەڵچوونێکی دەروونی‌و وێنەیەکی تورەی باوەڕپێکراوی سەردەمێکی ژیانی ئەمشاعیرەمانە ، کەئەم فرمانە بەربڵاوو دەمبڕانەی تێدا دەرکردووە ، کە ڕاست‌وڕاست ، ٠٠٠ وێنەی تێکشکانی سیاسی‌و بڕوانەمانی بەبنچینەو بنەڕەتیە بیری‌و فەلسەفی‌یەکانی جارانی‌یەو تەواو پێچەوانەی قۆناخی پێشوویەتی[٢٨] ٠٠٠» ، لێرەدا من وەڵامی ئەم لەسنوردەرچوونەی

مامۆستا نادەمەوە ، بەڵکو شیعرەکەخۆی ئەکەم بەبەڵگەیەك بـۆ بەربەرەڵایی‌و درشتی‌و وردنەبوونەوەی قسەکانی خـۆی • ئـەم شیعرە کە ساڵی (١٩٥١)بۆ یەکەمجار دانراوەو لەحـوزەیرانی (١٩٨٣)(٢٠)دا تەواوکراوە ، بـریتی‌یە لەبەسەرهاتی کابرایەکی ڕوخـاو کـە بەتوڕەیی‌و توندوتیژی‌و لێوکرۆژتنەوە ملی ڕێگەی گرتووەو ئەمقسانە ئەکات لەبەرخۆیەوە ، تائەگاتە بەرتەلارێك کە ئەچێتەژوورەوەو قەواڵەی ڕوخاندنی خـۆی مـۆر ئەکات • جـا تەلارەکە کوێیـە یان چی‌یـە ؟ بـەجێ‌ئەهێڵم بۆ خـەیاڵو ئەندێشـەی خوێنـدەواری خۆشـەویست • لەپاشـدا پلەبـەپلە بەرزی‌ئەکەنەوەو ئەگاتە پایەیەکی بەرزو ئەوسـا هەڵپەرستانی وەك‌خـۆی لێ‌کۆئەبنەوە ••• بـەڵام ئـەم کابـرا ڕوخاوە وەك هەموو کەسێك هاوڕێیەکی نزیکی هەیە کە ساڵەهای ساڵ پێکەوە ڕازونیازیان گۆڕیوەتەوەو شان‌بەشانی یـەك تێکۆشاون ، ئـەم لـەگەڵ ئەوەدا کەڕوخاوە ، هاوڕێکەی هـەر لەبـیرە یـان بڵێین نامەیەکی ئەوهاوڕێیەی هەمیشە لەبیرەو جاروبار لەکاتێکدا کە خەم‌و خەفەتی لێ‌ئەوروژێت ، نـامەی هاوڕێکەی ئەخوێنێتەوە کەوا دیارە وەڵامی نامەیەکی خـۆیەتی • هاوڕێکەی لەنامەکەدا ئەڵێت : «تۆ پاکانە بۆ کورسی پەرستی‌ی خۆت ئەکەیت‌و ئەتەوێ وام تێ‌بگەیەنیت کـە گـوایە بـۆ خـزمەتی گـەل لـەدوژمنان نزیك‌بوویتەوە بـەڵام ئەوەبزانە تەنانەت خزمەتێکی بچوکیشت پێ‌ناکـرێت ، بـەومەرجـەی لەگـەڵ سـوودی سـەری‌گەورەدا

نەگونجێت ، خۆ ئەگەر ئەو سەری گەورەیە بیەوێ پیلانێک بکێشێت نەک هەر ناتوانی بەرهەڵستی بکەیت ، بەڵکو هەرخۆت ئەکات بەمقاشێك بۆ ئەو پیلانە ، ئەوسا تێ ئەگەیت ئەو گەورەیی یەی تۆ باسی ئەکەیت (تەپڵی بەتاڵ)ە ٠ واتە بەکورتی مەبەست لە (تەپڵی بەتاڵ) کابرایەکی ڕوخاوە ، جا ئەمە کێ ئەگرێتەوەو لەکێوە نزیکترە ؟ خوێندەواران ئەیزانن ! ٠

دوای ئەوەی باسی تەواوکردنی ئەو سێ شیعرەمان کرد ، پێویستە هەندێك لەشیعرەکانی تر بدوێینو ئەو تەمومژە بڕەوێنینەوە کە بەخۆڕایی دەوری گرتوون ، لەوانەی کە قسەیان لەسەرە :

(١) شیعری (ستفاتمە) : وەك لەپێشەوە ووتمان ، ناوەرۆکی ئەم شیعرە هەرچەندە کەباسی چینایەتیو جیاوازی چینایەتی تێدایە ، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرۆژەیەی کە لەپێشدا باسم کرد ، نەك بۆ جیاوازی پلەی کۆمەڵایەتی نێوان منو ئەوکچەی شیعرەکەی بۆ دانراوە ٠ ئەمێنێتە سەر هۆی شیعرەکە ، ئەوی ڕاستی بێ هۆی یەکەم ئەوەیە کە لەوکاتەدا ، واتە لەساڵی (١٩٥٠)دا کچێك سەرنجی ڕاکێشابوومو ، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە لەشیعرەکەدا دەرئەکەوێت ، ئەو کچەش ، هەمان هەستی بەرامبەر من هەبوو بەڵام هەستی هەردووکمان دوراندوربوو ، هەروەها من ئەوساکە ، ئەو هەرزەکارەی جاران نەمابووم ، کە بەچاوپێ کەوتنێك زمانم ببەسترێ وەکو لەشیعرەکەدا

پیشان‌دراوه، هەروەك هەوڵی ئەوەم نەداوه، ئەو خۆشەویستی‌یه لەو قۆناخه تێپەڕبكات بۆ قۆناخێكی‌تر ٠ هۆی دووەمی ئەوشیعره، ئــەوەیه : لەهەمان ساڵدا ، هاوڕێی بەڕێــزم كــاك (ئەكــرەمی عیززەت نەجیب) ، كــه لەوكاتەدا لەكــۆلیجی (حقوق) بــوو ، شیعرێكی بــۆ هێنام كه یەكێك لەشاعیرانی ئــەو كۆلیجه ، بەسەر كچەقوتابی‌یەكانی ئەوسای ئەو كۆلیجەدا هــەڵیدابوو ، شیعرەكه زۆرجوان‌بوو و یەك‌بەیەك ناوی كچەكانی هێنابوو ، جگه لەوەی كه (جوانی‌ی) تایبەتی هەر یەكێكیانی وەك چەپكەگوڵێكی ڕازاوه پیشـان‌دابوو وەك خـۆم بەبـیرمداهاتو ، یـان كاك (ئەكــرەم) پێشنیازی‌كرد ویستم شیعرێكی لەوبابەته دابنێم ، بەڵام ئەوسا ، واتــه ســاڵی ( ١٩٥٠ ) زۆربــەی ئــافــرەتــانــی لای ئێمــه پەچــەیان‌ئەگرتەوه ، و هیــچ دەســتەیەكی وا لــەئارادا نــەبوو شــیعریان پێــدا هــەڵبدرێت ، بێجگــه لــەوانەی مــامۆســتای قــوتابخانەبوون ، لــەبەرئەوه لەپێشــدا ویســتم نــاوی چــەند مامۆستایەك لەوانه كەپێ‌ی‌ئەڵێن (ست) ، بهێنم‌و هەریەكه بەپێ‌ی ئەو جوانی‌یەی تێیدایه پێیداهەڵبدەم ، بۆ ئەم مەبەستەش چــەند بەیتێكم دانا كــه پێویست‌ناكات لێــرەدا باسیان‌بكەم ، لــەپاشدا هاتمەسەر ئــەوەی كــه هەمووی بەسەر ئــەوكچەدا هەڵبدەم كــه لەپێشدا باسم‌كردوەو ناوی (ست‌فاتمه)م لێ‌نا ٠

بەكورتی هــۆی دانانی شیعری (ســت‌فاتمه) ئــەوانەبوون كــه باســم‌كردن ، و پێشــی هــەموویان پــەلامــاردانی چینــی

دەسەڵاتدار بوو لەشیعریکی دڵداریدا ، و بۆئەوەی بەسەرهاتەکە کاریگەرتربێت ، هـاتووم خـۆم وەك هەرزەکارێك پیشانداوە کـە لەئاستی خۆشەویستەکەیدا زمانی گـۆناکات ! ، هـەروەك خۆشەویستەکەم وا پیشانداوە کـەگوێ لـەڕازی مـن ناگرێت ، لەکاتێکدا نەمن ئـەو هەرزەکارەبووم‌و نەئەویش بەوجۆرەبووە کـەباسم‌کـردووەو نـەخولیای ژن‌هێنانیشـم لەسـەردابووە تـا (کۆشك‌وتـەلار)لێکمـان دووربخـاتەوە ، یـان ببـێ بـەدڕکی مەم‌وزینی نێوانمان •

لێرەدا پرسیارێك دێتەپێشەوە ، ئەویش ئـەوەیە : «ئـایـا شاعـیرێك ئەبێ وەك ( فۆتۆگرافێك ) وێنـەی دەوروپشتی‌خۆی بگـرێت ؟ یـان بۆی‌هەیە سەربەست‌بێت لەهـەڵبژاردنی وێنـەو تێکەڵکردنی ئەو ڕەنگ‌و سیفاتانەدا کە ئەیەوێ وێنەیان‌بگرێت ؟ هەرچەندە لێرەدا شوێنی ئـەوە نابێتەوە بەدرێـژی وەڵامی ئـەم پرسیارە بدەمەوە ، بـەڵام ئەوەندە ئـەڵێم ئـەگەر وێنـەگرتنی (فۆتۆگرافی) بکـەین بەمەبەستی سەرەکی‌ی شـیعرو ئـەدەب ، ئەبێت هەزارەها چیرۆك‌و شیعری بەرزی جیهان ، هەر لەیۆنان‌و ڕۆمانەوە تائیمڕۆ بخەینە پشت‌گوێ(٢٠) •

بابێینەوە سەر بـاسی شیعرەکەی (سـت‌فاتمـە) ، کـاتێك شیعرەکە بڵاوبووەوە ، بـوو بـەمایەی قسەوقسەلۆکی هەنـدێك لەوانەی کەخۆیان بـەباسی لاوەکی‌ی شیعرەکەوە سەرقاڵ‌ئەکرد وەك‌ئـەوەی : ئـەبێ ئـەم (سـت‌فاتمـە)یـە کێ‌بێت ؟ ، یـان

له(فاتمـــه)كـــاندا كاميان جوانتـــرن ؟ ···هتد · وەك هـــەموو مەبەستێكيان ئەوەيێت باسی (مستفاتمه)بكـــەن بە بنێشتەخۆشەی ژێردانيان ، لەمەش ناخۆشتر ئـــەوەبوو كـــە زۆربەی ئـــەوقسەو بەندوباوانەيان ، ئاڕاســـتەی يـــەكێكی دياريكراو ئـــەكرد جـــا لەبەرئەوەی سنوورێك بـــۆ ئەوقسانە دابنێمو سەرنجی خـــەلكی لـــەوانە دووربخـــەمەوە كـــە نـــاويان ئەهێنـــان ، نـــاچاربـــوودم لـــە(١٩٥٧)دا كـــە بـــۆيەكەمجـــار شـــيعرەكانيان چـــاپكـــرد ، ڕوونكردنەوەيەك لەســـەر شيعرەكە بنووسم ، چـــونكە ئـــەمزانی ئـــەوجـــۆرە قســـانە بـــەهۆی چـــاپكردنی شـــيعرەكەوە ديســـان ســـەرهەلئـــەدەنەوە ، بـــۆيە ئـــەم ڕوونكـــردنەوەيەم نـــووسی :

«ئەمەويێت خوێندەواری خۆشەويست ئەوە بزانێت كە ناوی فاتمە وەنەبێت ناوێكی ڕاستەقينەبێت ، بـــەلكو وەك لەگەلێ چـــيرۆكدا نـــاوی خـــواستەمـــەنی بـــۆ قارەمانی چـــيرۆكەكە دائەنـــرێت ، ئـــەميشـــ شـــتێكە وا ···· هتـــــد[٣١]) واتـــە نـــەمووتـــــووە **(ئەوكەسەی ئـــەم شيعرەی بـــۆدانراوە شـــتێكی ڕاست نیيە)** ، **بەلكو ووتـــوومە : (ناوی فاتمە وەنەبێ ناوێكی ڕاستەقينەبێت)** كە ديارە جياوازیيەكی زۆر هـــەيە لەنێوان ئـــەم دوو قسەيەدا ، لەپاشدا ئەممانايەم بەجۆرێكیتر دووبارەكردووەتەوەو ووتوومە:

**«وەكو لـــە گەلێ چـــيرۆكدا ، نـــاوی خواستەمەنی بـــۆ قارەمانی چـــيرۆكەكـــە دائـــەنرێت ، ئەميشـــ شـــتێكە وا» واتـــە نـــاوەكە ناوێكی خواستەمەنیيە نەك قارەمانەكە ، وابزانم پێويستنەكات**

لەوە زیاتر لەسەری بڕۆم ، چونکە ڕوونکردنەوەکە زۆر ئاشکراو دیارە ، لەگەڵ ئەوەشدا هیوا هەیە ئەم ڕوونکردنەوە ئاشکراوڕوناکە بەپێچەوانەوە تێگەیشتوە • وەك ئەو ووتارەی نووسەری لاو کاك(جەمال محەممەد) لە (ڕۆژی کوردستان)دا دەربارەی (ڕازی تەنیایی) نووسیویەتیو ئەڵێت : (•••• ئەو وێنەیەی کە هەردی بۆی ئەخشاندوین ••• وامانلێئەکات کەبڵێین هەردی دڵدارێکی گەورەی سەردەمەکەی خۆیبووە ،کەچی هەردی خۆی ڕەفزی ئەم واقیعە ئەکات ، بەتایبەتی لەشیعری (چەپکەگوڵێك بۆ ستفاتمە)دا ئەڵێت : (ئەمەوێ خوێندەوار •• ئەوە بزانێت کە ناوی فاتمە وەنەبێت ناوێکی ڕاستەقینەبێت •• هتد)(٢٢) لەپاشدا (کاك جەمال) بەوەشەوە ڕاناوەستێتو ئەڵێت : کەواتە بەم پێوانەیەبێت مامۆستاهەردی نەدڵدار بووەو نەدڵداریشی کردوە)(٢٣) • من لێرەدا مشتومڕ لەسەر دڵداری ناکەم ، بەڵام ئەو سەرەتایەی ئەو کردوویەتی بەپاڵپشت بۆ قسەکانی ، ئەو ئەنجامە ناگەیێنێ کە ئەو پێیگەییشتوە ، جگە لەمانەش کاك (جەمال) گەلێك قسەی تریشی کردوە کە لێرەدا شوێنی وەڵامدانەوەی نییە •

(٢) شیعری (ئۆباڵی خۆت بەئەستۆی خۆت) :

کەوا دەستپێئەکات :

**(بەدەستی خۆت کەجامت خستە سەرلێوت غەشیمانە••هتد)**

ئەم شیعرە هەرچەندە (٣) بەیتەو ئەو هەموو قاوو قسەڕاوخستنە

هـەڵناگرێت کـە هـەندێك دوایانخستوە ، بـەڵام ئەوقسـانە ناچارم ئەکەن کەمێك باسی بکەم ، بۆ نمونە (کاکەی فەللاح) ئەم شیعـرە ئـەکـات بـەنمـونـەیـەك بـۆ (مـرۆڤێکی تـوڕەو ڕقلەخۆهەڵساو[٢٠]) لەکتێبەکەیدا ، بەڵام لەوشریتەدا کە لەکاتی ووتارەکەیدا تۆمارکراوە[٢٠] ، ئەڵێت :

«وەك مرۆڤێکی توڕەو شـاعیرێکی پەشیمانو ڕقلەخۆ هەڵساو» ، ئاشکرایە کە مەبەستی لە(شاعیرێکی پەشیمان) ئەوەیە کەگـوایە مـن لەشتێك یـان کارێك پەشیمانبوومەتەوە بۆیە ئـەم شیعرەم ووتـوە ٠ وە لـەبـەرئـەوەی هـەنـدێکـەسی ـساویلکەشـ وا تێگەییشتوون ، بەپێویستی ئەزانم هەندێك باسی هۆی دانانی بکەم ٠ ئەم شیعرە سەرەتای چیرۆکێکە هەروەك (تەپڵی بەتاڵ)و ئـەو سێ بەیتەی پێشەوەی ، قسەی قـارەمانی چـیرۆکەکـەیە ، کـەئەیکـاتو لەپـاش ئەوە خۆی ئەکوژێتو کەخـەڵکی ئەچـن بەدەنگیەوە ئەبینن لەکاغەزێکدا تۆباڵی کوشتنی خۆی خستوەتە ملخۆی ، بەڵام هۆی خۆکوشتنەکەی نەنووسیوە ، لەدواییدا پاش چـەندساڵێك ئـافرەتێك کـە ژنی کابرابووە یـان هاوڕێیەکی نزیکی ، لەسـەرەمەرگدا ئـەو بەسەرهـاتە ئەگێڕێتەوەو هـۆی کوشتنی مێردەکەی یان هاوڕێکەی دەرئەخات ، کە پێویستناکات لێـرەدا بـاسی بکەم ، بەکـورتی ئـەم شیعرە بـریتی یە لـەوەی کـە بـاسمکرد ، کـە لەپاشـ خۆکوشتنی (حەمـەی کـەریم)ی جوانەمەرگ بەبیرمداهاتووە ، هەرچەندە بەسەرهاتی قارەمانی

ئەم شیعرە زۆردوورە لەبەسەرهاتی (حەمە)ی جوانەمەرگەوەو ، زۆرتــری لــەخۆکوشتنێکەوە نزیکە کــە لەسەرەتــای منــداڵیما بیستبووم ، لێرەدا بەوەندە ئەبڕمەوە ٠

لەوانەیە بووترێت : ئــەگەر وەکو (کاکەی فەللاح) ئــەڵێت نەگەیشتوینە ئــەوپەڕی (بێهیوایی‌و دەستلەخۆشتن[٣٦]) ، بــۆ کابرایەك ئەکەیت بەقارەمان کەخۆی ئەکوژێت ؟!

لەوەڵامی ئەمەدا ئەڵێم ، شاعیری زۆر لەمن گەورەتری وەك (گۆتە)ی ئەڵمانی لە (ئێش‌وئازارەکانی ڤێرتێر[٣٧])دا قارەمانی چیرۆکەکەی خــۆی‌ئەکوژێت‌و ئاشکرایە کــە ئــەو چیرۆکەش بەسەرهاتی یەکەم‌دڵداریی خۆیەتی ، لەگەڵ ئەوەشدا کەس ئەو گلەیی‌یەی لێ‌نەکردوەو ئەوڕووداوی خــۆکوشتنە هیچی لــەپایەی ئەو کەم‌نەکردوەتەوە ٠

★ ★ ★

پاش‌ئەمانە ، لام‌وایێ کاتی ئەوە هاتووە بپرسم : من بۆچی وازم لەشیعرووتن هێناوە ؟! پێشــئەوەی وەڵامی ئــەم‌پرسیارە بدەمەوە وای بــەچاك‌ئەزانم چاوێك بەشیعرەکانی لــەمەوپێشی خــۆما بگێــڕم ، تــا لــەبەررۆنــاکی ئــەو پشــکنینەدا شــتێکم دەست‌بکەوێت‌و بیکــەم بەچەمسەری باسەکە ٠ بێ‌گومان ئــەگەر رۆشنبیرێك بۆ ڕاستی‌بگەڕێت لەشیعرەکانی (ڕازی تەنیایی)دا ، دوو دیــاردەی زەق بــەدی‌ئەکات ، یــەکەمیــان ئــەوەیە : کــە لەساڵی (١٩٣٩) بەدواوە تاساڵی (١٩٤٤)یش (تانکۆی تاقانــە

خـونچەکەی لێدەرچێت) ، مـن تاقەشیعرێکم نـەووتوە کەناوی شیعری لێبنرێت !! کـە ئەمەشـ دیـاردەیەکی سەرنجڕاکێشەو ئەگەڕێتەوە بۆ جۆری موتالاکردنی ئەو سەردەمەم،کە بریتیبوو: لەخوێندنەوەی کتێبی ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبو زمانو لەمانە گرنگتر ئەوەیە : لەوسەردەمەدا ، بۆیەکەمجار ، ئاشنایەتیم لەگەڵ سەرەتایەکی (فەلسەفە[٣٨])دا پـەیداکرد • دیـاردەی دووەمیش ئـەوەیە : لەساڵی (١٩٤٤) بـەدواوە یـان ڕاستتر ئەوەیە بڵێم لەداانی (شۆڕشی نائومێدی)یەوە ، توانیومە خـۆم لەو قۆناغە ڕزگاربکەم ، بـەلام چـۆن ڕزگاربووتێك ؟ ، ئـەگەر چـاوێك بـە(ڕازی تەنیایی)دا بگێڕی ئـەبینی : سـاڵیوا هـەیە تـەنیا شیعرێكو سـاڵی واهـەیە دووشیعرم تێـداووتوە ! خـۆئەگەر ئەوەمان بیربێت کە سـاڵی واهەیە تـاقەشیعرێکیشم دانـەناوە ، ئەوسا ئـەتوانی بڵێیت : هەندێكجار ، لـەدووساڵدا شـیعرێکم پێووتـراوە ! تـەنانـەت ئـەگەر شـیعرە سـیاسییەکانیشـی بخەیتەسەر ، بڕواناکەم شتێکی ئەوتۆ لەم دیاردەیە بگۆڕێت ! ، بێگومان ئەم دیاردەیـە پێویستی بەلێکۆڵینەوەو لێکدانەوەیەکی ورد هەیە • هەرچەندە مـن نازانم ئەو ڕۆشنبیرەی سەرنج لـەم دیاردەیە ئەدات، چۆنی لێك ئەداتەوە، بەلام من بەش بەحاڵیخۆم، بـڕوام وایـە : تـۆوی ساردبوونەوەی لەوەدوام ، هەر لەساڵی (١٩٤٤)ەوە خەریکی چەکەرەکردن بـووە لەدەروونمدا ، بۆیـە ساڵی جارێكو دووجارنەبێت ، شیعرم نەووتوە •

هەرچەندە ئەمەی ووتم : هێشتا (گریمانە-فەرەزییە)یەکە،

بەلام ئەوەندە زەمینەکەی پتەوە ، کە پێویستی بەلێکۆڵینەوەو[٢١]
شیکردنەوەیەکی تایبەتی هەیە ، هەرچۆنێک بێت ، ئەوەی
لەمەوبەر باسمکرد ، دەری ئەخات : کەمن هەرگیز شیعرم نەکردوە
بەپیشەیەکی هەمیشەیی ، بەڵکو ساڵی جارێك یان دووجار ،
**لەبارودۆخێکی تایبەتیدا شیعرم داناوە یان بابڵێین : ڕازی دڵی**
خۆم تێدا دەربڕیوە ٠

شایانیباسە ئەگەر ئێستا سەیری کتێبخانەکەم بکەیت
زۆربەی ئەوکتێبە فەلسەفییانەی تێدائەبینی کە لەسەرەتای
هەرزەکاریمدا خەریکی خوێندنەوەیان بوومو کە دووجارو
سێجار لێمونبوونو کڕیومنەوە ، لەکاتێکدا ئەگەر بگەڕێیت
بۆ یەکێك لەدیوانی ئەو شاعیرانەی لەسەرەتای لاویمدا
شیعرەکانیان ویردی سەرزمانم بوونو زۆربەیانم کڕیبوو ،
ئێستا لەکتێبخانەکەمدا نایانبینی ، چونکە هەرجارێك
لەناوچووبن ، جارێکیتر هەوڵمنەداوە بیانکڕمەوە ! ، مەبەستم
لەم قسانە ئەوەنییە خۆمهەڵکێشم یان وای پیشانبدەم کە گوایە
من هەر خەریکی خوێندنەوەی فەلسەفەم ، وەیان لەوانەم کە
خوانەخواستە ، لەدەریای فەلسەفەدا مەلەئەکەن ! بەڵکو مەبەستم
ئەوەیە : خوێندنەوەی ووتارێکم پێخۆشترە لەخوێندنەوەی
گەلێك دیوان ، بەمەرجێك ووتارەکە شیکردنەوەیەکی فەلسەفی
یان ئەدەبی یان ڕامیاری یان دەروونی تەنانەت یان یاسایی وای
تێدابێت کەسوچێکی نادیارم ، بەشێوەیەکی زانستیانە

پیشان بدات • دیارە شیعری ئـەو شاعیرانـەی لـێ دەرچێت کـە لەئەدەبی جیهانیدا لوتکەیان گرتوە ، چـونکە شیعری ئـەوجۆرە شـاعیرانە لـەم یاسایە بـەدەرن ، وە لـەگەڵ شی کردنەوەیـەکی سـەرکەوتـوانـەدا لـەتای تـەرازویەکـدان بـەلای منـەوە • لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوەش بڵێم : کە تەنانەت خوێندنەوەی شیعری ئەوجۆرە شاعیرانەش ، لەلای من کاتو ساتی تایبەتی خۆی هەیە ، لەکاتێکدا خوێندنەوەی شی کردنەوەیەکی ئـەدەبی یـان فەلسەفی... ، لەهەموو کاتو ساتێکدا بۆلای خۆی ڕاپێچم ئەکات! •

بەهەرحاڵ ، پایەی شیعر لەلای من بە سێ قۆناخدا تێپەڕیوە : لەسـەرەتای هـەرزەکاریو سـەردەمێکی لاویشـمدا ، پـایەی هەرشیعرێك لەلای من لەهەموشتێك بەرزتر بووەو ئـەگەر بـڵێم دڵی من ئەوسا هەر جێی شیعری تێدائەبووەوە لەڕاستیم لانەداوە، کەئەمە قۆناخی یەکەمە • بەڵام کە بەهۆی خوێندنەوەی ئەوجۆرە کتێبانەوە تامی شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستیانەم چەشت ، وردەوردە ئەم پارەی دوایی جێی خۆی کردەوە لەدڵو دەروونـدا، تا وای لێ هات بوو بەهاوشانی شیعر، هەروەك چۆن ڕۆمانسێتیو ڕیالیزمی سەردەمێك هـاوشانی یەك بوون لەسەردەمێکی ژیـانی مندا ، کەئەمەش قۆناخی دووەمە •

لەپاشتردا لـەگەرمەی موتالاکردنی ئـەوجۆرە کتێبانەدا ، کـاتێکم زانی شیعرم فـەرامۆش کردوە ، بێ ئـەوەی پێ بـزانم ، کەئەمەش قۆناخی سێیەمەو تائیمرۆ درێژەی کێشاوە •

لەم قۆناغەدا وەکو باسمکرد…شیعری لوتکەکانو چەند کاتێکی تایبەتی لێدەرچێ ، شیکردنەوەیەکی سەرکەوتوانە ، یان لێکۆڵینەوەیەکی باش بەلای منەوە هەزار شیعر ئەهێنێ .

لەگەڵ ئەوەشدا ، جاروبار ، لەهەندێ بارو دۆخی تایبەتیدا پرشنگی شیعر منی بۆلای خۆی ڕاکێشاوەو لەمەودواش ڕەنگە هەر ڕامبکێشێت ، کە ئەمە هیچ لەویاسایەی پێشو ناگۆڕێت . ئەمەی کەباسمکرد ئەوە ئەسەلمێنێ : کە کەلێجار وارێك ئەکەوێ چیرۆکنوسێك یان شاعیرێك لەسەرەتای ژیانیدا شیعر بڵێتو پاشتر ڕووبکاتە بابەتێکیتر ، وەیان چیرۆکنوسبێتو جاروباریش شیعربڵێتو ، ئەگەر سەیری ژیانی شاعیرو نوسەرانی جیهان بکەین ، ئەم دیاردەیە زۆر بەزەقی ئەبینین لەژیانی ڕۆژانەیاندا ، کەپێویستی بەدرێژکردنەوە نییە ، تەنانەت ئەم بابەتگۆڕینە ئەوەندە شتێکی ئاساییە هیوا هەیە بەدووسێ دێڕێك لێی ئەدوێت بێ ئەوەی هیچکەسێك سەرزەنشتی بکات کەنزیکترینیان وەلامی (میخائیل نوعەیمە(١٠)) یە کە لەچاوپێکەوتنێکدا لێیان پرسیبو : «بۆچی لەسەر شیعروتن نەڕۆیشتی ؟» لەوەلامدا وتبوی : «… چونکە خۆبەستنەوە لەشیعردا ، ماندوم ئەکات بەتایبەتی خۆبەستنەوە بەکێشو قافیەوە ، دوای ئەوەش کەدیم شیعر جێگەی بیروڕاکانی منی تێدانابێتەوە ، بەتایبەتی بیرە فەلسەفەییەکانم وازملێهێناو ڕومکردە پەخشان …(١١)» .. جا منیش ئەگەر بمەوێ وەك

«میخائیل نوعەیمە» بەدووسێ دێڕ وەڵامبدەمەوە ئەتوانم لەسەر شێوەی ئەو بڵێم : «کەوازم لەشیعر هێناوە ، نەك هەر تەنیا لەبەرئەوەیە : کە نەتەوەی کورد پێویستی بەشیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستیانە زیاترە[٢] ، بەڵکو لەبەرئەوەی خۆشم شیکردنەوەیەکی لەوبابەتەم لەهەموشتێکی دنیا پێخۆشترە ، وەیان لەلای من هەمان تامی شیعری جاران ئەداتو لەگەڵ شیعرە نەمرەکانی دنیادا هاوتایە» ·

بەڵام داخەکەم ، ئەم ڕاستی‌یەی من وا بەسادەیی دەرمبڕی ، (کاکەی فەللاح) تێی‌نەگەیشتوە ، یان ڕاستتر ئەوەیە : نەیویستوە تێی‌بگات ! بەڵکو هەوڵی‌داوە بە(بیردۆزە)یەکی داتاشراوی نارەوا لێکی‌بداتەوە کە هەروا بەسەرپێوە پەنجە بۆهەردوولایەنەکەی ڕائەکێشم کە لەمەوپێش وێنەی هەردووکیانمان پیشاندا · لایەنی یەکەمیان ئەو بەشەیەتی کە (بێدەنگی لەمەوپێشی) منی پێ‌لێك‌ئەداتەوەو لایەنی دووەمیش ئەوەیە کە لەبەر ئەو ڕوناکی‌یەدا (بێدەنگی لەمەودوا)شم بەشتێکی مسۆگەر لەقەڵەم‌ئەدات ! ! ! لەبەشی یەکەمدا (کاکەی فەللاح) : (بێباوەڕی)و (پشت‌کردنە میللەت)و (قێزهاتنەوە لەجوانی‌و دڵداری)و ·· گەلێ شتی لەم‌بابەتانە ئەکات بەهۆی «بێدەنگی لەمەوپێشم» ! ، کە هەریەکێك لەمانە پێویستی بەشی‌کردنەوەیەکی تایبەتی هەیە ، کە هەڵی‌ئەگرم بۆ نامیلکەیەکی تایبەتی ، بۆ «بێدەنگی لەمەودواشم» .

(کاکەی فەللاح) وەك ووتم زۆر بەدڵنیایی‌یەوە دەری ئەخات کە : جارێکی‌تر من ناتوانم شیعرێکی (هاوسۆز)و (هاوبیر)و (بەهرەدار )ی وەك ئەوانەی پێشووم بڵێم ... !! ، **وەنگە ئەو دڵنیایی‌یەی لەوەوە هاتبێ کەخەڵکی لەوساڵەدا ( ۱۹۷۷ ) منیان بەمردو لەقەڵەم دابوو ! !**
بەهەرحاڵ ، من (کاکەی فەللاح) دڵنیائەکەم کە ئێستاش بوکی شیعر جاروبار ئەمجولێنێ‌و ، بەتاقیکردنەوەی تایبەتی خۆم بۆم‌دەرکەوتووە : هەرجارێك ئارەزویەکی دەروونی یان هێزێکی هاندەر ، پاڵی‌پێوەنابم ، توانیومە شیعری وابڵێم ، کەجێی پەسەندکردنی خاوەن‌دڵان بێ‌و ئەگەر (کاکەی فەللاح) وابزانێت (بێ‌دەنگی من) ئەگەڕێتەوە بۆ (بێ‌دەسەڵاتیم) لە شیعرووتندا ، زۆر بەهەڵەداچووەو تەواوکردنی ئەوسێ‌شیعرەی سەردەمی لاویم لەم چاپە تازەیەداو پاش (۳۳ ـ ۳۷) ساڵ بەڵگەیەکی بچوکە بۆ سەلماندنی قسەی من‌و پوچبوونەوەی پێش‌بینی‌یەکەی (کاکەی فەللاح) .

★ ★ ★

پێش ئەوەی دوایی بەم پێشەکی‌یە بهێنم ، پێویستە سێ‌خاڵی گرنگم لەبیرنەچێت ، یەکەمیان ئەوەیە : لەچاپی یەکەمدا شیعرەکان بەپێی کاتی دانانیان نەنوسراون ، کەئەمەش ماوەی بەهەندێ‌کەس داوە بەئارەزوی خۆیان ساڵ‌و کات بۆ شیعرەکان دابنێن ، یان هیچ‌نەبێ هەڵەی تێدابکەن ، لەبەرئەوە بڕیارمدا

لەمچـاپەدا بەپێی کۆنیو تازەیییان ، بیاننووسمەوە ، تـاکو بەوجۆرەش لەچاپبدرێنو بـۆ ئەمەبەستە ڕەنجێکی زۆرم داوە سـۆراخێکی زۆرم کردوە تاکو سـاڵی دانانیان ساغبکەمەوەو لەمڕووەوە گـەلێ برادەر یارمەتییان داوم ، کـە هەرئەوەندەم لەدەستدێت پڕبەدڵ سوپاسیانبکەم(٢) •

خاڵی دووەمیش ئەوەیە : ئەو چوارینانەی بەتـایبەتی بـۆ (سـەرکێلی) چەند جوانەمەرگێك نووسراون ، هـەڵبژاردەیەکم لەمچاپەدا جیاکردوەتەوەو خستوومنەتە دوای هـەمووشیعرەکانی ترەوە •

ئەمێنێتە سەر خاڵی سێیەم : لـەچاپییەکەمدا ، نـەستونی ڕاستکردنەوەی ووشەی چەوت هەیەو نەپێڕست بۆشیعرەکـان دانراوە ، جـگە لـەوەی کـە چەنـدجارێك نیوەبەیتێك لەکـاتی چاپکردندا لەبـیرچوە ، بـا ئەوەش بڵێم : کـە خۆشـم ، لەکاتی نووسینەوەی شیعرەکاندا ، دەستکاری هەنـدێ ووشە یان ڕستەم کردوە ، کـە لەپەنجەیدەست تێپەڕنابـن ، لەبـەرئەوە نـاچارم لـەمچـاپەدا دەستکارییەکیانبکـەم ، هـەروەها ئـەو دێـڕانە بنووسمەوە کـە چاپییەکەم نەیگرتوون ، بەڵام دڵنیابن لـەوەی هەرگیز مافی ئـەوە بەخۆمنادەم دەستکاری گەوهەرو ناوەرۆکی شیعرەکان بکەم ، ئەگەرچی ئێستا هەندێکیشیانم بەدڵنییە ! ! ! بەمبۆنەیەوە ، ئـەبێ بڵێم کـە نەمتوانی پێشەکی چاپییەکەم ، لێرەدا دووبارەبکەمەوە کـە لـەکاتی خـۆیدا هـاوڕێی بـەڕێز

(د٠مارف خەزنەدار) نووسیبووی ٠ چونکە وەلامدانەوەو ڕاستکردنەوەی هەندێك بیروڕای چەوت لەم پێشەکییەدا شوێنی بۆ دووبارەکردنەوەی پێشەکییەکەی (د٠مارف) نەهێشتەوە ، بۆیە داوای لێبوردن ئەکەم(١) ٠

لەکۆتاییدا چاپی دووەمی (ڕازی تەنیایی) پێشکەش خوێندەوارانی خۆشەویست ئەکەم ، هیوام وایە ئەمیشیان وەك چاپی یەکەم بەدڵ بێت ٠

**ئەحمەد هەردی**

**١٩٨٤/٤/١٢**

## «پـەراوێـزەکـان»

١ـ کاروانی شیعری نوێی کوردی ـ بەرگی یەکەم ـ حەمە حەمەئەمین قادر (کاکەی فەللاح) ـ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا ـ ١٩٧٨ •

٢ـ سەرچاوەی پێشوو ل : (١٣٥ ـ ١٦٤) •

٣ـ هـاوڕێیانی بـەڕێز کاک (مسـتەفا سـالح کـەریم)و کاک (عـەلی شـەونم) بۆیان گێـڕامەوە ووتیـان : ئێمـەیان کـردبوو بـەلیژنەی هەلسـەنگاندنی ووتارەکەی (کاکـەی فەللاح) ، لەکاتێکـدا کـە پێویسـتبوو چـەندڕۆژێك لەوەوپێش ووتارەکە بخوێنینەوە ، تابتوانین هەلیسەنگێنین ، بـەلام ئێمەش وەك گوێگرەکانی‌تر تەنیا لـەکاتی خوێندنەوەی ووتارەکەدا گوێمانلێ‌ی‌بوو کەدیارە بەو ماوە کورتە هیچ‌کەسێك ناتوانێ لەکونو قـوژبنی ووتارێکی وا دووروودرێژ تێ‌بگات •

٤ـ کاروانی شیعر ـ پێشەکی (کاکەی فەللاح) ل ـ ١٠

٥ـ سەیرنەوەیە (کاکەی فەللاح) ووشەی (گـریان)ی پێش (هـاوار) خستووە ، ئـەم گۆڕینە هەرچەندە کێشـڕو مانای بەیتەکە ناگۆڕێ ، بـەلام سـروشتو ئاهەنگی پیتەکان ، پێشخستنی ووشەی (هاوار) ئەسەپێنێ کەداخەکەم لێرەدا ماوەی باسکردنی نی‌یە •

٦ـ کاروانی شیعر ل ـ ١٦٤ •

٧ـ مامۆستا (عـومەر عـارف شێخ مەحمود) مامۆستای بـیرکاری بوو لەقوتابخانە ئـامادەیی‌یەکانداو یەکێکـە لەنووسـەرو ڕوناکبـیرانی کـورد ، لەگـۆڤاری (شەفەق)دا بەناوی (هەسان)ەوە ئەینووسی •

٨ـ کـاتێك شـیعرەکەم تـەواوکرد ، مـامۆسـتا (عـومەر عـارف) ، لـەڕۆژی (١٩٨٣/٥/٢٠)دا سەیرانێکی بـۆ منو کـۆمەلێ برادەر سازکردو قسەکەی بەجێ‌هێناو بێ‌ئێوەناخۆش ڕۆژێکی خۆشمان بردەسەر بەلام مامۆستا ئێستاش ئەلێت : ئەگەر (لەبێ‌بەختی گیرفانی) من نەبوایە تۆ نەتئەتوانی شیعرێك کە لەسەرەتای لاویدا نووسیوتە لەتەمەنی (٦١) سالیدا تەواوی‌بکەیت •

٩ـ ڕەنگە ئەوانەی دلبەندی شیعری‌کۆن بن ئەم تەواوکردنە بەهونەرێك نەزانن،

چونکە لەشیعری کلاسیکیدا هەربەیتێك بۆخۆی سەربەخۆیەو مەرج نییە پەیوەندی بەبەیتێکی ترەوە هەبێت ، بۆیە تەواوکردنی شیعرێکی وەها شتێکی ئەوەندە گران نییە. بەڵام لەشیعری نوێدا، کە وێنەکێشانی تاقیکردنەوەیەك، مەبەستی سەرەکییە ، تەواوکردنی پاش (٣٠-٣٧) ساڵ شتێکی ئاسان نییە.

١٠- کاروانی شیعر ل - ١٦٣ - سەیرئەوەیە (د. عیززەدین) پێشبینییەکی تر لەزمان (گۆران)ەوە دەربارەی من ئەگێڕێتەوە کە بەتەواوی پێچەوانەی ئەم پێشبینییەی (کاکەی فەللاح)ە ، ئەویش ئەوەیە کە (د. عیززەدین) ئەڵێت، لەگۆرانم بیستووە ووتویەتی : (هەردی کانیاوێکە پەنگی خواردوەتەوە ، هەرکاتێك تەقییەوە کەس نازانێت چۆن ئەتەقێتەوە !! ) ، بەم بۆنەیەوە ، ئەبێ دان بەوەدابنێم کە گێڕانەوەی پێشبینییەکی وەها لەپاش چەندساڵ لەلایەن (د. عیززەدین)ەوە ، پیشەی مرۆڤێکی ڕاستگۆیە ، چونکە لاموایە هەردکتۆر خۆی ئاگای لەم قسەیە بووبێ ، بۆیە مایەی سوپاس و ستایشە .

١١- کاروانی شیعر - ل ١٤٨ .

١٢- بڕوانە : ماکسیم گۆرکی - في الادب والنقد الادبي - یوسف عبدالمسیح ثروة - توزیع دار بغداد - مطبعة الوفاء - بغداد بلاتاریخ - ص - ٢٨ .

١٣- هەمان سەرچاوەی پێشوو - هەمان لاپەڕە .

١٤- تەوژم = تیار .

١٥- ڕازی تەنیایی - ل ٣ - چاپی یەکەم - ١٩٥٧ .

١٦- بڕوانە : نووسەری کورد - ژمارە ٧ - تەموزی ١٩٨١ - لاپەڕە ٦٣ - ووتاری (ئەنوەر قادر محمد) .

١٧- ڕازی تەنیایی - پێشەکی لەلایەن (مەعروف خەزنەدار)ەوە نووسراوە لەسەر ئەرکو لەژێر چاودێری (جەمال خەزنەدار)دا لەچاپدراوە - چاپخانەی شەفیق - بەغدا - نەورۆزی ١٩٥٧ .

١٨- کاك (مەحمود تۆفیق خەزنەدار) کوڕی تۆفیق ئەفەندی عەزیز ئاغای خەزنەدارەو لەکۆنەوە هاوڕێمە .

١٩- ئەم زانیارییانە ، مامۆستا (عومەر مەعروف بەرزنجەیی) بۆی هێناوم کە

یەکێکە لەنووسەرە لاوەکان. ئەوی ڕاستیبێ من ئەم زانیارییانەم بەو ووردییە لەبیرنەمابوو بۆیە بەپێویستی ئەزانم سوپاسیبکەم .

٢٠ـ من هەرچەندە هۆی دانانی شیعرەکەو تەنانەت ئاهەنگەکەشم بیرنەمابوو ، بەلام سالو بۆنەی ئاهەنگەکە ، هاوڕێی بەڕێز کاك (مستەفا صالح کەریم) بیریخستمەوە ، زۆر سوپاسیئەکەم .

٢١ـ وەك لەپێشەوە ووتمان (کاکەی فەللاح) لەپاشدا ئەو ووتارەی لەگەل چەند ووتارێکیتردا بلاوکردەوە بەناوی (کاروانی شیعری نوێی کوردی)یەوە .

٢٢ـ بڕوانە کاروانی شیعر ل ١٥٦ ـ ١٥٧ .

٢٣ـ بڕوانە کاروانی شیعر ل ١٥٦ ـ ١٥٧ .

٢٤ـ بڕوانە کاروانی شیعر ل ١٥٦ ـ ١٥٧ .

٢٥ـ کاروانی شیعر ل ١٤٥ ـ ١٤٦ .

٢٦ـ گومانی تێدانییە کە لەڕووی کێشەوە (وەمزانی) ڕاستترە ، هەروەها وەنەبێ لەڕووی زمانیشەوە ڕاستنەبێ ، هەرچەندە لەچاپی یەکەمیشدا (وامزانی) نووسراوە ، (کاکەی فەللاح)یش هەر وایوەرگرتوە ، بەلام سەیرئەوەیە ، وەك ئەمەی ڕاستنەکردوەتەوە دواووشەشی گۆڕیوە ، واتە(نرخی کوڕانە)ی کردووە بە (نرخی گرانە) ، لەوەش سەیرتر ئەوەیە لەپەراوێزەکەیدا ، (کاکەی فەللاح) ئەلێ : «لەچاپدا بەهەلە ـ کوڕانە ـ نووسراوە ، ئەگینا (گرانە)یە !!! » ، بڕوانە کاروانی شیعر ل ١٤٦ پەراوێزی(٨) .

٢٧ـ کاروانی شیعر ل ١٤٦ .

٢٨ـ سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەڕە .

٢٩ـ ئەوەی پێویستە بیلێم کەمن ئێستامبوایە لەسەر ئەووەزنە ئەمشیعرەم ئەدەووت ، چونکە ئەمکێشە کێشێکی عەروزی کۆنەو زۆرتر بۆغەزەلو ستایش دەستئەدات ، بەلام بۆ چیرۆکی شیعری (چیرۆکەشیعر) کێشێکی زۆر تەنگەبەرەو ئەوانەی لەم کێشە شارەزابن ، ئەم ڕاستییە ئەزانن ، لەگەلئەوەشدا ، توانیم تەواویبکەم .

٣٠ـ ئەوی ئەیەویت زیاتر لەم باسە بگات ، تکایە بڕوانێتە ئـەم سەرچاوانە :
١/ (فـن الشعر ـ ارسطوطاليس ـ ترجمة عن اليونانية وشـرحه الـدكتور عبدالرحمن بـدوي ـ دارالثقافة ـ بيروت ١٩٧٣ ص٢٦ ومابعدها) ٠
٢/ (في الادب والنقد ـ مكسيم گوركي ـ ترجمة يوسف عبدالمسيح ثـروة ـ فصل كيف تعلمت ان اكتب ـ ص٢٣ ومابعدها) ٠
٣/ (النقد الادبي الحديث ـ د٠ محمد غنيمي هلال ـ الطبعة الخامسة ١٩٧١ ص٥١ ومابعدها وص٢٢٩ ـ ملاحظة المؤلف في الحاشية) ٠
٣١ـ بڕوانە (ڕازی تەنیایی) ـ چاپی یەکەم ـ ١٩٥٧ ـ ل٢١ ٠
٣٢ـ گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە ـ ٤٩ ـ سالی ١٩٧٨ ـ ل٤٠ ٠
٣٣ـ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە ٠
٣٤ـ کاروانی شیعر ل١٦٤ ٠
٣٥ـ پێویستە لێرەدا بڵێم کە ئەوشـریتە هاوڕێی بەڕێزم مامۆستا (عبدالله عزيز) بۆیهێنام زۆر سوپاسی‌ئەکەم ٠
٣٦ـ کاروانی شیعر ل١٦٢ ٠
٣٧ـ ئێشو نازارەکانی ڤـێرتێر ، چـیرۆکی شاعیری گەورەی ئەڵمانی گـۆتەیە (١٧٤٩ ـ ١٨٣٢) کـە لەسەرەتای لاویـدا دایناوەو باسی یەکەم دڵـداری خـۆی ئەکات ، بڕوانە (آلام فـرتر ـ ترجمة احمد حسن الزيات ـ الطبعة التاسـعة ـ مطبعة لجنة التاليف والترجمـة والنشـر ـ القاهرة ـ ١٩٦١ ـ ص٥ ـ ٦ مقدمة الدكتور طه حسين ـ ص٧ ـ ١٥ ) ٠
٣٨ـ ئەوی لەوسەردەمەدا ، بەشێوەیەکی ئاسانو ساکارو بۆخوێندەوارێکی سادەی وەکومن نووسرابێت لەوبابەتەوە ، کتێبەکانی (د٠ ئەحمـەد ئەمین)بـوو ،ـ وەك : (مبـادیء الفلسـفة)و (قصة الفلسـفة اليونانية)و (قصة الفلسـفة الحديثة) ، کـە ئەمی دواییان دوو جـزم بوو ، یـەکەمیانی لەئینگلیزیەوە کـردبوو بەعەرەبیو سیانەکەی دواییشی لـەگەڵ (د٠ زكي نجيب محمود)دا ڕێکخستبوو ناوی (تصنيف)ی لێنابوو ، وە چەندکتێبێکی تری لەوبابەتەش٠
٣٩ـ من هەر لەکۆنەوە ـ واتە لەسالی (١٩٥٠)وە شیکردنەوەم لەجیاتی (تحليل)

بەکارهێناوەو ئێستاش هەر (شیکردنەوە) بەڕاستتر ئەزانم ٠

٤٠ـ بڕوانە ووتاری (لقاء مع میخائیل نعیمة ـ جهاد فاضل ـ مجلة ـ آفاق العربیة ـ السنة السادسة ـ العدد٢ تشرین الاول ١٩٨٠ ـ ص١٢٤) ٠

٤١ـ ئەوی ڕاستیبێت لەدەقی پرسیارەکەی (جهاد)و لەوەڵامەکەی (میخائیل نعیمة)دا باسی وێنەکێشانیش کراوە کە سەردەمێك (نعیمة) خەریکیبووە ، بەڵام من هەر ئەوبەشەم وەرگرت کە پەیوەندی بەشیعرەوە هەیە، کێ ویستی دەقی تەواوی پرسیارو وەڵامەکە بخوێنێتەوە ، بڕوانێتە هەمان سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەڕە ٠

٤٢ـ (کاکەی فەللاح)یش دانیناوە بەم ڕاستیەداو دەریئەخات کە : ئەتەوەی کورد «زۆرتر پێویستی بەلقەگرتگەکانی تری ئەدەب هەیە ، بەتایبەتی بەشی ڕەخنەولێکۆڵینەوەی زانستیانە» ـ (کاروانی شیعر ـ ل٦١) ـ هەرچەندە من مەبەستم لەقسەی پێشوو، تەنیا ڕەخنەی ئەدەبی نییە، بەڵام (شیکردنەوە)و (لێکۆڵینەوە) لەهەمووبارێکدا هاوبەشتی یەکترنو ئەبێ یەکتری تەواوبکەن٠

٤٣ـ جگە لەو بەڕێزانەی لەشوێنیخۆیدا باسمکردون ، بەپێویستیئەزانم سوپاسی مامۆستایان : کاك (عومەر عارف)و کاك (فەرەیدون عەلی ئەمین)و کاك (ئەکرەم عیززەت)و کاك (شەوکەت غەفور بابان) بکەم ، بەتایبەتی کاك (عومەر) کە هەمیشە ڕاوێژم پێکردوە ، چونکە ئاگای لەبارو دۆخی زۆربەی شیعرەکانمە ٠

٤٤ـ بەم بۆنەیەوە ئەبێ دانبەوەدابنێم : کەچاپی یەکەم شیعرەکانمی لە ونبونو لەبیرچونەوە پاراستوە ، بۆیە بەپێویستی ئەزانم سەرلەنوێ سوپاسی هاوڕێیانی بەڕێز : (د٠ مارف خەزنەدار)و مامۆستا (مەحمود توفیق)و کاك (جەمال خەزنەدار) دووبارەبکەمەوە کە هەریەکەیان دەستێکی هەبووە لەبەرهەمهێنانی چاپی یەکەمدا ٠

شیعرەکانی پایزی تەنیایی

چاپی یەکەم / ١٩٥٧

چاپی دووەم / ١٩٨٤

## بێ ئارامی[1]

ئاخو داخو دەرد ، لەدەست تەنیایی ،
پەشێوی بێحەد ، دەردی بێدوایی ،
ئەم سەرسامی‌یە ،
بێ ئارامی‌یە ،
دڵ ناکامی‌یە :
کەی دێ کۆتایی ؟

★ ★ ★

بۆ هەرکوێ ئەچم پێی خراپترم٠٠٠
ناسرەوێ دڵەی پڕ لەئاگرم٠٠٠!
نە لەناو گوڵزار ،
نە لای خزم‌ویار ،
نە لەدەشت‌وشار ،
ئۆقرە ناگرم٠٠٠!

★ ★ ★

لەدەست شار هەڵدێم ، ئەچمە ناو گوڵزار ،
لەوێش هەڵناکەم ، دێمەوە ناوشار !
وەك ئارام‌نەماو ،
دڵ‌وپێ سوتاو ،
خانەی‌خەو ڕوخاو ،
لەدنیا بێزار٠٠٠!

کە بەتێکەڵبوون ، وەها بێزارم ،
بۆچ بەتەنیایی : پەشێوە کارم ؟!
بۆ وەك ڕەنجەڕۆم ؟
وەڕس بووم لەخۆم ؟
بۆهەرکوێ ئەڕۆم ،
دڵ بێ قەرارم ؟!

سلێمانی/١٩٣٨

---

(١) ئەم شیعرە لەچاپی یەکەمدا نی یە ، یەکێکە لەو شیعرانەی لەسەرەتای هەرزەکاریمدا دامناوە ، ڕەنگە هاوڕێیەکی وەك مامۆستا (عومەر عارف) نەبێ ، کەسێکی‌تر لێی‌نەبیستبم ، شیعرەکە خۆی شتێکی ئەوتۆ نی یە ، بەڵام لەچاو کاتی خۆیدا (کەنزیکەی نیوسەدەیەك لەمەوبەرە)شتێکی تازەیە : چلەڕوی بابەتو چلەڕوی ڕیزکردنو هەڵبژاردنی ووشەی نوێوە ، بۆیە بەپێویستم‌زانی بڵاوی‌بکەمەوە ٠

## (فەلسەفەی دڵداری[1])

شیعری «شیلی»یە ، لەعەرەبی‌یەوە کراوە بەکوردی ·

کە[2] جۆگا تێکەڵی چەم بێ‌و چەمیش تێکەڵ بەدەریابێ
شەماڵیش پڕ لەهەستی بێ ، نی‌یە شت تاکو تەنیابێ

بەقانونی خودا[3] ئەشیا ، ئەبێ : تێکەڵ بەیەکتربن
ئیتر ، بۆچی منوتۆ تێکەڵی یەکتربین نابێ ··؟!!

---

(۱) لەبیرمدێت کاتی‌خۆی ، ئەم‌شیعرەم لەگۆڤاری (المجلة)ی (عبدالحق فاضل)ەوە وەرگرتوە کەئێستاش دەقە عەرەبی‌یەکەیم لەبیرە ، ئەوەشم لەبیرە کە لەگۆڤاری (گەلاوێژ)دا بڵاوکراوەتەوە ، بەڵام نووسەری بەڕێز مامۆستا (عومەر)ی بەرزنجەیی بیری‌خستمەوە، کە لە(١٤)ی ئەیلولی(١٩٣٩)دا ئەم‌شیعرە لە حەوتەنامەی (ژین)دا بڵاوکراوەتەوە ، واتە چەندمانگێك پێش‌ئەوەی گۆڤاری (گەلاوێژ) لەشوباتی (١٩٤٠)دا ئەم‌شیعرە بەپەخشان بکات بەکوردی‌و لەژمارە (٣)ی ساڵی(١)دا بڵاوی‌بکاتەوە · کەچی لەساڵی(١٩٤٢)دا کە ئەم‌شیعرەی من لە(گەلاوێژ)دا نووسرا ، تێبینی‌یەکی وای لێ‌نووسرابوو کە وابگەیێنێت ، گوایە : شیعرەکەی من لەپەخشانەکەی (گەلاوێژ)ەوە وەرگیراوە !! لەکاتێکدا کە شیعرەکە چەندمانگێك پێش پەخشانەکەی (گەلاوێژ) ، لە (ژین)دا بڵاوکراوەتەوە وەك مامۆستا (عومەر) بیری‌خستمەوە · بەم‌بۆنەیەوە زۆر سوپاسی مامۆستای ناوبراو ئەکەم ، هیوادارم وێنەیان زۆربێت ، هەروەك سوپاسی مامۆستا (مستەفا ساڵح کەریم) ئەکەم کە ناوی (عبدالحق فاضل)ی بیرخستمەوە ·

(۲) لە(گەلاوێژ)دا (کەجۆگە) نووسراوە ·

(۳) لەڕوی کێشەوە ئەبێ بڵێت : (خووا) ـ بەدوو (واو) ـ لەبەرئەوە (خودا)م بەراستترزانی ·

کە کێوو کەژ بکەن ماچی هەموو ئاسمانی بەرزوشین ،
شەپۆلیش هەروەکو دڵدار ، لەملیەك دەستی ئالابێ ..

ئەبەد نابێ: کە خوشکی گوڵ، برای دەرکاتەو لێیدووربێ،
کە تیشکی ڕۆژ ، زەمینی هەروەکو دولبەر ، لەکۆشابێ

ئەوا مانگیش ئەکا ماچی بەحر، گەرتۆش نەکەی ماچم[٤]..،
هەموی بێکەڵکە ئەم ماچانە ، بێتۆ فائیدەی نابێ[٥]..
بەغدا/١٩٣٩

(٤) لە(گەلاوێژ)دا «گەرتۆش نەکەی ماچێ» نووسراوەو بەپێی ئەوەی کە مامۆستا (عومەری بەرزنجەیی) بۆی نووسیوم وادیارە لە(ژین)یشدا هەر (ماچێ) نووسرابێ ، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە نووسیم .
(٥) ئەم شیعرە لەچاپی یەکەمدا نییە .

## (ئەی دیدە پەری[1])

ئەی دیدەپەری ! بەو دەمە ، بەو کوڵمەگوڵینە
بۆکەس نی‌یە تاسەر ، ئەوەرێ : ئەم گوڵیژینە
تاسەر نی‌یە ئەم‌نازە ، وەها دووری مەبینە
ئەوچاوە گەلاوێژە خەڵاتی کە برینە !
ئەو زوڵفە کە ئێستاکە دووتوێی عەنبەری چینە،
ڕۆژێکی‌کە دێ ، تێکەڵی توێی خاکی زەمینە !

★ ★ ★

ئەوگەردنە بێگەردە کەوەك تەختی بلوورە ،
ئەو لێوە کەوەك خونچە تەڕو ناسكو سوورە
ئێستاکە بەبێ‌ڕەحمی سزای جەورو فتورە
لای‌وایە ، کە ژین فانی نی‌یەو ڕێکەیی دوورە !
نایزانێ کە هەر پەنجەیێ لەم‌خاکی زەمینە
کوڵمی دەهەزار(لەیل)و دەمی سەد(مەم‌وزین)ە !

---

(١) ئەم شیعرە کاتی خۆی ، لەڕۆژنامە ، یان بابڵێین : حەوتەنامەی (ژین)داو بەناوی : (دوایێت لەبیربێ) بلاوکراوەتەوەو لەهەندێ شوێندا ، دەستکاری شعرەکە کراوە (بڕوانە ژینی ژمارە ـ ٥٧٧ ـ ٢٤ی ئەغەستۆس ـ ١٩٣٩ ـ ل ٤) کە لەدەرفەتێکی تردا باسی‌ئەکەم • لەسالی ١٩٥٧دا من کە شیعرەکەی خۆمم لەبەربوو ئەوەبوو لە(ڕازی تەنیایی)دا بلاوم‌کردەوە بێ‌ئەوەی گوێ‌بدەمە دەستکاری‌کردنەکەی (ژین) •

شایانی باسە من ئێستاش دەقی شیعرەکەی خۆمو هەندێك شوێنی ئەو دەستکاری‌یەی ژینم بەتێکڕایی لەبیرماوە ، بەلام بۆئەوەی بەوردی شوێن‌و ئەندازەی دەستکاری‌یەکان بزانم ، حەزم‌کرد دەقی بلاوکردنەوەکەی (ژین)م لەبەردەستدابێ ، لەم ڕووەوە زۆر سوپاسی هاوڕێی بەڕێز کاك (عەبدوللا عەزیز) ئەکەم ، کە نەك هەر ژمارەو سالی ڕۆژنامەی (ژین)ی بۆدۆزیەوە ، بەڵکو دەقی بلاوکردنەوەکەی ژینیشی بۆهێنام •

ئـەمڕۆ دڵی بێچارە ئـەبەی ئـەیخەیە نـاوداو
نـایزانی سبەینێ ئـەکەوی سـەرکزو دامـاو !
ئەوجوانی‌یە ئەڕواتو لەچـاو گوم‌ئەبێ وەك‌ئاو
ئەوڕۆژە ئـەبێ دائیمە هـەر بێنیە بەرچاو...
تـا ڕەحمێ‌بکـەی ئێستەکە بـەم زامو بـرینە ،
سـەرکزنەبی لـەو : جێگـە بێ‌سامانی زەمینـە

★ ★ ★

ئەم چەند قسەیەم،ووتوە بەتۆ ،ئێستە[1] بەچاکی
گـەرچی ئەشیزانم[2] : دڵی بەردت نی‌یەباکی !
مەڕوا نەرە ئەمڕۆ ، کـە بەڕو مەت گـوڵی تاکی
بـڕوانە سبەینێ : کـە لـەناو دامەنی خاکی !
سەد لـەیلی وەکـو تـۆ بووە لـەم ڕۆشنی ژینـە
ئێستاکە لـەناو ، جـەرگەیی تـاریکی زەمینە !

سلێمانی/١٩٣٩

(٢) لەچاپی یەکەمدا لەباتی (ئێستا) ، (ئەمڕۆ) نووسراوە (ل٢٤) .
(٣) لەچاپی یەکەمدا (گەرچی ئەشزانی) نووسراوە ، هەمان لاپەڕە .

# (تانگۆی کوردی[1])

تاڤانەخـونچەی بـاخی ژیـانم ••
زیندوکەرەوەی ئـاواتی بێگیانم !
ڕۆشنکەری : ڕێگای ژینو مانم ••
بـاڵەدەستی ، ژینیپەستی ، شارودێ ، شارودێ
ڕاکەینو ڕووبکەینە : چۆڵهەردێ، ناوهەردێ •
تـەنیا ، وەك ئـاسکۆڵەی کۆسار ،
ڕووبکەینە قەدشاخو ناوگوڵزار[2] •

★ ★ ★

لەقەدپاڵی شاخی هەزاربەهەزار ••
لەسای سێبەری درەختی ناوگوڵزار •

---

(١) ئەم شیعرەم لەسەر ئاوازێکی ڕۆژئاوایی داناوە ، لەچاوپێکەوتنێکی ئەدەبیدا (ساڵی/١٩٨١) ووتبووم ڕەنگەئـەم شیعرەم ساڵی/١٩٣٨ ووتبێت ، بـەڵام لەدواییدا چەند بەڵگەو سۆراخێك بیریانخستمەوە : کە لەساڵی/١٩٤١دابووە، پێشـی ئەوەی ببم بـەمامۆستای قوتابخانە بەیەکدووەمانگێك ، بـەهەرحال ، مـن ئێستا لـەدووشـت دڵنیـام : یـەکەمیان ئـەوەیە دانـانی شـیعرەکە ساڵی/١٩٤١بووە ، دووەمیان ئـەوەیە ، دڵنیـام لەوەی کاتێك ئـەم شیعرەم ووتووە ، هیچ جۆرە ئاشنایەتیم لەگەڵ هیچ حیزبو سیاسەتێکدا نـەبووە ، بەڵام هاوڕێی بەڕێزم : (د• عیززەدین مستەفا) وائـەزانێت ئـەمشیعرە دوای ساڵی/١٩٤٩ دانراوە ، لەبەرئەوە ئەیکات بەبەڵگەیەك بۆ بیروباوەڕی ساڵانی دوای١٩٤٩ی من ، بڕوانە دکتۆرانامەکەی مامۆستای ناوبراو : (الواقعیة في الادب الکـردي ـ دار المکتبـة العصریة ـ بلا تـاریخ ، بیروت ـ ص١٠٩) ، لەکاتێکدا کەوەکو لەپێشەوە نووسیم ، ساڵی/١٩٤١ ووتراوە •

(٢) ئەم دێرە لەچاپی یەکەمدا ، لەبیرچووبوو •

کونجێبکەین : بەهێلانەو هەوار ..
دەستلەگەردن، تاکومردن، شۆخوشاد ،شۆخوشاد
خەمیدنیا : بەماچ بدەینبەباد ، هەربەباد ...
گـۆنـات ، هـەڵمـژم پـڕبـەدەم
سورهەڵگەڕێ هێندە ماچیکەم ..!

سلێمانی/ ۱۹٤۱

# شۆڕشی نائومێدی

«لەکاتێکدا کە ئادەمزاد ، بەرێکەوت بۆیدەرنەکەوێت : کە ئەو تریقەی پێکەنینانەی ، بەماکی خۆشەویستی ئەزانی ، هەوڵنی تەفرەدانو دەست برینە ، لەکاتی وادا ، ئادەمزاد ، ڕقی لەدڵداریو خۆشەویستی بەجۆرێك هەڵئەستێ کە حەزناکات تەنانەت چارەی ئەو یادگارانەش ببینێت کە لەو دڵدارییە بەجێماون•• لەکاتێکی وادا ئەم هەڵبەستەی خوارەوە دانراوە» :

★ ★ ★

بناغەو چینی دیواری ،!
تەلاری بەرزی دڵداری

بەسەر لانەی دڵا ڕوخا ! تەپوتۆزی خەمی هێنا
بەدوی باڵداری ئاواتی ، فڕیوی بێسەروشوێنا !
دەسا ئەی پاییزیماتەم ! ئەوەندەم تاسە پێماوە :
هەموو ئەو یادگارەی لەو : ژیانی عەشقە جێماوە
بەجارێ وەك گەڵا سەروەیخەزانت گشتی ڕامالێ ،
بەوردی هەرگەڵایێکی ، ببا بۆ : قوژبنو چالێ••!

★ ★ ★

دەبا (با) ڕەش لەدوایدا ،
لەبیابانی•• لماویدا

تەپوتۆزێکی وا بێنێ ، هەوا یەکجاری بخرۆشێ
سەری ئەو قوژبنوچالە ، وەکو گۆڕیچە داپۆشێ !

لەپاشانا بەبایوەشتا ، لەسەردا هەوری ڕەش بێنێ ••!
بەگۆڕی یادگارا ، با ، بەخوڕ تاوێ ••• ببارێنێ ••!
دەبـابمرێ بـەیەکجـاری لـەگۆڕی تەنگەوتـەنیـادا
نیشانەو ناوی هـەلگیرێ لەنـاو : بازاڕی دنیادا •• !

★ ★ ★

بـەڵێ با گەردەلولێ بێ ،
ئەوی بۆنێکی تۆی لێبێ ••

وەکو ئەوپوشە ڕاپێچی بکا بـۆ : گۆڕی تـەنیایی •••
بـەکوێیا بـابچرپێنێ : نقـامی عومری کـۆتایی ••!
پەپو[1] ، هاوڕازی[2] ویرانەو، نیشانەی مەرگی ڕوناکی
بەدەنگی شومی بـا شیومن بکا بـۆ گیانی نـاپاکی •••
لەسەر ئەو دەنگەو ئاوازە ، دەبـا شەیتانی ڕاڕایی ••،
سەمای پڕتەوسی بێشەرمی بکا بۆ عەشقی کۆتایی ••!

★ ★ ★

دەبـا دەستی سـتەمکاری :
ژیـانی پـڕ لـەزۆرداری

لـەیادا بیسرێ شێوەت لـەیادی ژینو گەردونا •••!
بەبێ ڕەحمانە غەرقی کا ، لەبەحری قوڵی ونبوونا ••!
ونی کا بـا لـەبەرچاوم ، نیگـاری چـاوی فێـلاویت

---

(١) پەپو : لێرەدا مەبەست (کوندەبەبو)ە کەلای ئێمە (کوندەپەپو)شی پێئەلێن •
(٢) لەچاپی یەکەمدا (هامراز) نووسراوە (ڕازی تەنیایی ــ ل١٩) •

گـوڵی بێبۆنی جوانیتو بـزەی سەرلێوی زەهراویت
بـەتاپۆی[٣] یـادگاری تێکشـکاوی بێسـەروپێوە ..
بەدڵداری عومرکورتو شـەوانی جوانەمەرگێوە ..!

سلێمانی/١٩٤٤

(٣) تاپۆ لەشارەزوور بەتارماییەك ئەڵێن کە بەعاستەم دیاربێت ، لێرەدا لەجێی (شبح)ی عەرەبی بەکارهێنراوە .

## (دڵێکــی تێکشــــکاو[1] ••!)

ئەمشیعرە ، هەرچەندە لـەچاپی یەکەمدا حـەوت بـەیتە ، لـەگەڵ ئەوەشدا ڕۆشنبیران ، گـەلێك بـایەخیان پێداوەو لێی‌دواون ! هی‌وابـووە ئـەمشیعرەی ، بەیادکردنەوەی قۆناخێکی سـیاسی زانیوە ! لـەبەرئەوە پێی‌وابووە ، دوای ســاڵی ۱۹٤۹ دانراوە ! وەك هاوڕێی بەڕێز (د• عیزەدین مستەفا[2] ) ، هی‌واش بووە: گرموی لەسەرئەوە کردوە ، کە گـوایە من ناتوانم ئـەم شیعرە تەواوبکەم ! وەك هاوڕێی بەڕێز مامۆستا (عومەر عارف) ، هی‌واش بووە ، وەك مامۆستا (کـاکەی فەللاح) کەلای‌وابووە ، نەك هەرتەنیا لەمشیعرەدا نەمتوانیوە (بگەمە کۆتایی‌یەکی سەرکەوتوانە) ، بەڵکو جارێکی‌تر ناتوانم شیعرێکی تـری لەوبابەتە بڵێم !!•• ، بــەهەرحاڵ ، لەوانەشــە ، ئــەوانەی ئـاشنای شیعری کـۆنن ، ئەم تەواوکردنە بەهونەرێك نەزانن ! چونکە لەشیعری کۆندا لابردن‌و زیادکردنی چەندبــەیتێك ، شتێکی ئەوەندەگران نی‌یە •

هەرچۆنی‌بێت ، ئێستا ، کە شیعرەکەم تەواوکردووە پێشکەشی ڕۆشنبیرانی کوردی ئەکەم ، هیوامەوایە ،تامی هەمان حەوت بەیتەکەی پێشوی لێ‌ببینن •

ئەحمەد هەردی

**بەسەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم !**

**شــرێتی عــومری ڕابوردووم وەکوخەو دێتەبەرچاوم**

---

(۱) ئــەم شیعرە لــەچاپی یەکەمدا نــاوی (نــائومێدی)یە ، چـونکە لــەوێدا ، بەسەرهاتی‌دڵ ، کەمەبەستی سەرەکی‌ی شیعرەکەیە ، تەواونەکراوە ، بڕوانە (ڕازی تەنیایی – چاپی یەکەم – ل۲۳) •

(۲) هاوڕێی بەڕێز (د• عیزەدین ڕەسول) ، وائەزانێت ئەم شیعرە دوای ســاڵی (۱۹٤۹) دانــراوە ، لەبــەرئەوە بەیادکردنەوەی قــۆنــاخێکی سیاسی ، یــان بەشیوەنێکی ئەوقۆناخەی ئەزانێت ! ، بڕوانە دکتۆرانامــەکەی : (الواقعیة فی الادب الکردي ، ص ــ ۱۰۹) ، لەکاتێکدا ئەمشیعرە لەساڵی ۱۹٤٦دا ووتراوەو باسی بەسەرهاتی خۆشەویستی‌یەکەو هیچی‌تر •

شـەریتی چی ؟ سەراپا سەرگو روشتەی[٣] نـائومێدیمە
فلیمی پـڕ لە ناسـۆری هـەرەسـ هێنـانی لاویمـە

تروسکەی تیابەدیناکەم ، سـەرنجم چەندە لێداوە :
لەتـاپۆی نامـرادیمو تەمی ناسـۆری بـەولاوە ۰۰ !

ئـەوی ئـەوسـاکە ڕوناکی ئەدا بـەم ژینە شێواوە[٤]
دڵێکی پڕلەئاهەنگ بوو ، کەئێستا پاکی ڕوخاوە ۰۰ !

★ ★ ★

بـەڵێ ئەوسـا دڵێکم بوو ، کەسەرچـاوەی ژیـانم بوو
دڵـێ : مەڵبەنـدی ئاواتو تـەوژمو تینی گیانم بوو

دڵـێ : گوڵزاری دڵـداری و بەهەشتی خۆشەویستی بوو
وەکـو بتخانـە مەیـدانی بتـی جوانی پـەرستی بوو

لـەگـەڵ هـاوارو گریـانی هـەژارانا لـەشینابوو
لەگـەڵ ناڵـەی کـەساسانا لـەخورپەو ڕاچـەنینابوو

لـەژێرسایەی ئەوینێکا ، هـەمووسیحرێکی پۆشی بوو
لـەکونجێکی خەرابـاتا[٥] ، خـەریکی بـادەنۆشی بوو

---

(٣) لەچاپی یەکەمدا (سەرگوزشتە) نووسراوە ۰

(٤) لەچاپی یەکەمدا ، نووسراوە (ئەوی یەک تۆزە ڕوناکی ئەدا ۰۰۰) ۰
بیرمە من لەبنەڕەتدا ووتبووم : (ئەوی ئەوساکە ڕوناکی ئەدا ۰۰۰) ، بەڵام کەبۆ کاک (مەحمود تۆفیق)م نووسی یەوە ، خۆم ئەو دەستکاری یەم کردبوو ، کەئێستا ئەودەستکاری یە بەڕاستنازانم ۰

(٥) خەرابات : مەیخانە ۰

دڵــێبوو : دارودیــواری هــەموو مەستی نیگاریێبوو
هــەمــووسوچێکی دەســکردی ، بەڵێنی تاقــەیاریێبوو

دڵێ ، خونچەیتەمای وابوو ، لەخۆشیئەو دەمیواکا[٦]
کەتیشکی ئــەو لەلێویدا ، گوڵاوپڕژێنی دنیاکا ٠٠ !

دڵــێ ، ئامادەبوو ، تــاری ، هەزارئاوازی لێهەستێ
بەمەرجێ : گوڵبەدەم جاریێ بەمەستی لێیبدا،دەستێ !

تــەلاریدڵ ، کەدیــواری وەهــا مەستیئەوینیبوو :
لەباوەشگرتنی باڵای ، هەمووئاواتی ژینیبوو ٠٠ !

گوڵوگوڵزاری دڵ وابوو :خەیاڵی ڕۆژو هیشەویان :
(کەوا پرشنگیدووچاوت،بڕێژێ چاویبێخەویان[٧]!)

وەنەوشەو نێرگزو شەوبۆ ، هەموو سەرخۆشی تاسەیبوون
لەتەك سروەیبەیانیدا : تەماداری هــەناسەیبوون٠ !

هەناسەیئەو ، کەبێ ،ڕایانژەنێتو ماچیکا ، ڕوویان
کەدابێنێ ، لەجێی سروەیبەیانی ، زوڵفو گێسوویان٠٠!

---

(٦) دەمی واکا : دەمیبکاتەوە ٠

(٧) سەرچاوەی ئەم نیوەبەیتە لەشــیعرێکی (میخائیل نوعەیمە)وە وەرگــیراوە :
(کحل اللهم عيني بشعاع من ضياك كي تراك) ٠

هەموو پێکێکی مەینۆشی ، بەیادی ئەو ، کە پڕ مەی بوو
لەمەیخانەی دڵا کەیلی : بزەی ئەو جووتەلێوەی بوو !

هەموو پاڕانەوەی وابوو ، بەشێوانو سبەینانێ :
کەڕۆژێ لێوی پڕتاسەی ، لەسەر دوو لێوی ئەو دانێ !

★ ★ ★

کەچی ئەو کۆشکی چەندسالەی ، دڵم بنچینەکەی دانا
بەتەنیا گەردەلولێکی (نەهاتی) ، چووبەئاسمانا ..!

هەموو ئەو نیازو ئاواتەی ، لەناو ناخی دەروونابوو
لەداخی بێ بەڵێنی ئەو ، بەجارێ تەفروتوونابوو ..!

بەڵێ ، کاتێ بەخۆمزانی ، بەهاری پڕ ئەوین ڕۆیی
خەوو ئاواتی چەندساڵەو بەڵێنی پێ گەیین ڕۆیی ..!

گەلێکم پشکنی دنیا ، لەدووی ئەوجووتەلێوەی ئەو ،
هەزار ئەفسوس! نەئەوڕۆژم بەدی کردو نەشێوەی ئەو .. ،

نەپرشنگی لەخونچەیدا ، نەپەنجەیدا ، لەتاری دڵ[8] .. ،
نەبەژنی شۆخ وشەنگی بوو : بەمیوانی تەلاری دل[9] ..!

---

(٨) لەم بەیتەوە، بەتێکڕایی وەڵامی بەیتەکانی پێشوو دەست پێ ئەکات، بۆنموونە: نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ، پەیوەندی بەبەیتی دەیەمو یانزەیەمەوە هەیە .

(٩) ئەم نیوەی دووەمەش ، وەڵامی بەیتی دوانزەیەمەو تکاموایە لەبەیتەکانی تریشدا بگەڕێنەوە بۆ بەیتەکانی دوای بەیتی دوانزە ... هتد .

نـەچاوانی گوڵی ڕشتو نەکلچێوکێکی پیاهێنـا ٠٠!
نەپرچی نێرگزی مەستو ، وەنەوشەی شینی داهێنا٠٠!

نـەپێکی نایەسەرلێوو ، نەبیستم ڕازی شیرینی ٠٠٠
نـەماڵئاوایی لێ کـردم ، نـەئیتر شێوەییم بینی ٠٠!

★ ★ ★

بەڵێ ئەوخونچەیەی چەندهەنگ پەشۆکابوون لەژێرپێیدا
خەوی ڕۆژوشەوی وابوو : گزنگی چاوی تۆ لێیدا[10] ٠٠!

کەچاوی تۆی نـەدی شێوا ، لـەداخا کوڵمی خواکردی
گـەڵاکانی وەکو عومری منی بێچارە بـابردی[11] ٠٠!

تەلی دڵ، چەندەسەیری کرد، کەپەنجەی تۆی نەدی چاوی
دەروونی بوو : بەگۆڕیچەی هەموو ئاوازی تاساوی٠٠!

تەلاری دڵ کەڕۆشن بوو ، بەوەی تـۆبی بەمیوانی ٠٠
هەواری چۆڵ وهۆڵی بوو : بەگۆڕی گردی سەیوانی[12] ٠٠!

گوڵی باخی دڵم ، چاوی ، بەدوی تۆدا ئەوەندگێـرا٠٠
هەتاکو چاوەکەی خۆشی ، لەدەوری چاوی تۆ گێرا ٠٠!

---

(١٠-١١) لـەم دووبەیتەوە ، جارێکی تر ، وەڵامی بەیتەکانی پێشوو ، یەک بەیەک دەسـتپێ ئـەکات ، بـەڵام بـەدرێژی (بـڕوانە بەیتەکـانی دەیـەم و بەیتەکانی دوای ئەو) ٠

(١٢) گـردی سەیوان : گـردێکی بچوکە گۆڕستانی شـاری سلیمانی یە ، کەوتوەتە باشوری خۆرهەڵاتی سلیمانی یەوە ٠

وەنەوشەودەستەخوشکانی ، لەبێمەیلی هەناسەی تۆ ،
هەناسەی دەرنەچوودەمیانو تاساشن ، لەتاسەی تۆ ..!

وەیا ئەوپێکەڕەنگینەی کەهەرنەیبیستلەتۆ دەنگێ..!
لەداخا بادەکەیڕشتو ، سەریخۆیدایەبەر سەنگێ..!

لەپاشا ، گەردوتۆزقانی ، کـەوەککەرتی دڵیمنبوو
یەکی ڕوویکردەسوچێکو لەتاریکیشەوا وونبوو ..!

★ ★ ★

بـەڵێ ، ئێستا ئەویجێماوەبۆمن ، یادگارێکـە ..!
بەسەرهاتی دڵیوردو بەسەرچوونی بەهارێکە ..!

(لەسـالی ١٩٤٦دا ووتـراوە و
لەنیسانی ١٩٨٣دا تەواوکراوە)

## (شانزەساڵ چاوەڕوانی[1])

دوێنێ لـەتەك نـەمانی سورایی خـۆرنشینا ••
کەشەو هێواشـی بـاڵی ، کێشا بەسـەر زەمینا[2]

تـۆماری شـانزەسـاڵی ژیـانی خۆشـەویستیم
ئـاواتی پـڕلەتاسـەی دەروونو گیـانیبرسـیم

بـەجـارێ نـایەچـاڵی ژیـانی پـڕسـزاوە ••
کەشەوقی چـەندەگەنجی هـەژاری تیاڕزاوە[3] !

---

(١) ئەمشیعرە کـە لەسـاڵی ١٩٤٨دا ووتراوە ، یادکردنەوەی خۆشەویستییەکی سەرەتای هەرزەکاریمە (موراهەقە) کـە لەساڵی ١٩٣٨دا کۆتاییهاتووە ! ، واتە : لەکاتێکدا ووتراوە کەهیچ تێنوشوێنەوارێکی ئەوخۆشەویستییە لەدڵو دەروونمدا نەماوە ، بەلام گێڕانەوەی بەسۆزی بەسەرهاتێکی لەوێنەیخۆی ، لـەلایەن هـاوڕێیەکی ئـەوسامەوە ، بـووبەهۆی دانانی ئـەمشیعرە ، کـە لەدەرفەتێکیتردا باسیئەکەم •

(٢) لەچاپی یەکەمدا ، لـەباتی (کێشابەبیەر زەمینا) نووسـراوە : (کێشابەڕوی زەمینـا) •

(٣) کاکەی فەللاح لـەنێوان بـەیتی سێیـەمو چـوارەمدا ئەمبەیتەی نووسیوە :

(دوێنێ کـەوەك بـرایم ، بـەکوێری دانەنیشـتم
لەبڕ بەخۆری جوانیت ، لەبوونی خوا ، گەییشتم)

لەپێش هەمووشتێکدا ، (دوێنێ کەوەك برایم••) نییە ، بەلکو ڕاستییەکەی: (ئەوسـا کەوەك بـرایم••)ە ، جگـەلەوە ئەمبەیتە ، سـەرەتای کۆپلەیەکی تازەیە ، ئەکەوێتە دوای بەیتی شەشەم ، بـەلام لەبەر ئەوەی لەکاتی خـۆێدا

←

لەتەك هەموو عەزابو ژیانی بێهێوادا ،
ئەم ڕەنجیسالەهایەم ، کەگشتی چووبەبادا

لەتەك ئەمانەشا ، مـن ، هەرچەندە تێگەییشتووم
کەدووی خەیاڵی دووری ، پەریینیگارێ کەوتووم!

لەکانی قوڵی دڵما : کەبۆتە گۆڕیئاوات
ڕژاوە نەقشی باڵای بڵندی ئاڵووڵات !

هەبابەیلێ/١٩٤٨

---

←

تەواوم‌نەکردوە ، فرێدانیم بەڕاستتر زانیوە • باسی ئەوە لێرەداناکەم ، کە ناومرۆکی ئەم‌بەیتە ، وێنەیەك‌ئەکێشێت ، کە پێچەوانەی وێنەی شەش‌بەیتەکەی سەرەوەیەو ، کەئەبوو (کاکەی فەللاح) ، هەربەوەدا بیزانیایە ئەوبەیتە ئەکەوێتە دوای شەش‌بەیتەکەی پێشوو ، ئەڵێم : باسی ئەم‌خاڵە هەڵئەگرم بۆ شوێنیخۆی ، بەم‌بۆنەیەوە پێویستە ئەوەبڵێم کەمەبەست لەووشەی (هەژار) لەم‌بەیتەدا (بەسزمان)ە نەك ئەوهەژارەی (کاکەی فەللاح) لە(کاروانی ـ ل١٥٩)دا باسی‌ئەکات ، وەك لەشوێنیخۆیدا بەدرێژی لێی‌ئەدوێم •

## ( پێنج‌خشته‌کی له‌سه‌ر غه‌زه‌لێکی «شێخ‌نووری[1]» )

(١) قـه‌ت نه‌ده‌ی ئازاری گیانی مه‌ستو بێدارانی‌شـه‌و
خۆت نه‌خه‌یته به‌ر شـه‌پۆلی ئه‌شـکی بێ‌پایانی شـه‌و
ئه‌ی‌کچی خواوه‌ندی‌جوانی‌و ئه‌ی‌چرای دیوانی‌شه‌و !
«خـۆت‌بپارێـزه لـه ئاهی دلبـه‌ریندارانی شـه‌و[2]
نـه‌ك‌خواناکـه‌رده گـیرابێ دۆعای نـالانی‌شه‌و !»

★ ★ ★

(٢) وێلـم‌و تاریکـه ده‌ورم ، فه‌رشـی ڕێگـه‌م مه‌ینه‌ته
بێ‌که‌سم ، ته‌نیائـه‌نالم ، مه‌رگی‌خـۆم عه‌زره‌ته[3]
سازی ئاهه‌نگی‌شـه‌وانم ، سـۆزی‌جه‌رگی له‌ت‌له‌ته
«یـاوه‌رو یـاری ئه‌نیسم ئـاهو ئه‌شـکی حه‌سـره‌ته
ئـافه‌رین ئه‌ی باره‌که‌للا ، دیده‌یی گـریانی شه‌و !»

★ ★ ★

(٣) وانـه‌زانی ده‌سـتی‌خـه‌م یـادت له‌دلـدا ده‌ر ئـه‌کا
ئه‌شـکی‌خـوێنینم ده‌لیله بـۆ که‌سـێ بـاوه‌ڕ نه‌کا
گیانه‌که‌م به‌و تیشکی‌چاوه‌ی شه‌ڕ له‌گه‌ڵ ئه‌خته‌ر ئه‌کا

---

(١) شێخ‌نوری شێخ‌سالح (١٨٩٨ ـ ١٩٥٨) یه‌کێکه له‌شـاعیره گه‌وره‌کانی ئـه‌م چه‌رخی دوایی‌یه‌ی نه‌ته‌وه‌ی کورد (بـڕوانه ـ شیعرو ئـه‌ده‌بیاتی کـوردی ـ نووسینی ڕه‌فیق حیلمی ـ به‌رگی دووه‌م ـ به‌غدا ـ ل١٩٩ ـ ٢٠٨) •

(٢) سێ دێـڕه‌که‌ی پێشـه‌وه هی‌منه‌و دوودێڕی نـاوکه‌وانه‌که هی خوالێخۆشبوو شـێخ‌نوری‌یه •

(٣) له‌چاپی یه‌که‌مدا (ته‌نهانه‌نالم) نووسراوه ، کـه (ته‌نیـا) ڕاستره (بـڕوانه پێشه‌کی ئه‌م دیوانه) •

«دڵ ئەبێتەقەترەیێ خوێن‌و لەدیدەم سەرئەکا
هەر کەڕابورێ بەدڵما : سوحبەتی جارانی‌شەو»

★ ★ ★

(٤) هاودەمێ‌فەرموی : لەبەرچی کردەوەت‌گریانەهەر ؟
تافی لاوێتیتە ، لاوی ، قەلبەزەی سەیرانە هەر
منووتم سەیران‌و خۆشی پێشکەشی شادانەهەر
«ئەشکی حەسرەت لازمی جەمعی سیابەختانەهەر
شەو نمی سوبحە دەلیلی قەترەیەك گریانی شەو »

★ ★ ★

(٥) هەولی زۆرمدا ، لەداوی زوڵفی ئەو بێمروەتە
دەرچم‌و دوایی‌بهێنم ، بەم عەزاب‌و مەینەتە
پێی‌ووتم : بێسودە هەوڵت ، تاکوماوی جێگەتە[٤] !
«نوری ! لەم پێچ‌و خەمی زوڵفە نەجاتت زەحمەتە
لای سەخی تەبعان مەحالە ڕوخسەتی میوانی شەو .»

هەڵەبجە/١٩٤٨

---

(٤) ئەم دێڕە لەچاپی یەکەمدا لەبیرچووە .

## ( چەپکەگوڵێك بۆ «ستفاتمە» )

(لەپێشەکی ئەم دیوانەدا ، بەدرێژی باسی ئەمشیعرە کراوە : بۆچی دانراوە ؟ لەچ بارو دۆخێکیدا دانراوە ؟ ... هتد ، لەبەرئەوە هەرکەس حەزئەکات لەمبابەتە تێبگات ،بابگەڕێتەوە بۆپێشەکی ئەمدیوانە کە وەڵامی گەلێك پرسیاری جۆربەجۆری هەندێك برادەر ئەداتەوە) .

فاتمە[1] ! دووچاوی‌مەستت ، پـڕتەلیسمی جوانی‌یە
پـڕ شەرابی خۆشـەویستی‌و عارەفی یـەزدانی‌یە ،
بـەژن‌و باڵاکەت نموونەی : هـەیکەلی یـۆنانی‌یە ،
لارولـەنجـەت مۆسیقایە ، بەسـتەیە ، گـۆرانی‌یە
بووکی‌ڕازاوەی خـەیاڵم ، گیانەکەم سـتفاتمـە !
تـاقە ڕشـنگێکی چـاوت ئـەوپەڕی ئـاواتمـە..

★ ★ ★

گـەرچی دڵـداری لەخـاکی ئێمـەدا ، ئەفسـانەیە
هـەر بەتەنیا بـۆ کـوڕی خـاوەن‌تـەلار و عـانەیە
گیـانەکـەم ! ئـەمما دڵی‌مـن لـەو دڵـەشـێتانەیە
بێ‌ئەوەی هیچ شك‌بەرێ ، کـوژراوی ئەوچاوانەیە
هەر بەتەنیا خۆشەویستی شك ئەبەم ، ستفاتمـە !
سەروەتم ناوێ ، بـزەی تۆ : ئەوپەڕی ئاواتمـە ..

★ ★ ★

خۆشەویستی‌وا کـە نامەی خـوایە بـۆ پێغەمبەران
بەرزو ناسك ، وەك هەناسەی پـڕ گوڵاوی دولبەران
نەك وەکو حـەزکردنی دینارو گەوهەر پـەرومران

---

(١) لەچاپی یەکەمدا «فاتیمـە» نووسـراوە ، بڕوانە (ڕازی تەنیایی ـ ل٢١) .

ئـەو کەسانەی بۆ قڕانێ ، چەندە دڵیان هـەڵوەران !
خەڵقی تـر ، پارە پەرستی ، با بکەن ، ستفاتمـە !
مـن بەتەنیا ، تـۆ پەرستی ، ئەوپەڕی ئاواتمە...

★ ★ ★

زۆر کەڕەت هـانم ئەدا ، داخـی دەروونی پـڕ گڕم
بۆتی هەڵڕێـژم : سکاڵای ناسکی گـەرموگوڕم...
داخـەکەم ، کـاتێ کـەدێمە بـەردەمت ، ڕاقی وڕم
وام ئەشێوێنێ بـەجۆرێ نـایەڵێ هیچ دەر بڕم ..!
بووکی ڕازاوەی خەیاڵم ! گیانەکەم ستفاتمـە..!
گوێیە بێ ئەمڕازە شلکەی ، ئەوپەڕی ئاواتمـە..
سلیمانی/١٩٥٠

## ( دوو چەشن دڵداری )

ئــەمشیعرە لەچــاپی یەکەمدا نــاوی (دلداری کچی‌تازە)یە(۱) ، ئەگەرچــی لەبنەڕەتدا نــاوی (دووچەشن دلداری) بوو ، هەروەها ئەمشیعرە (هەمان چیرۆکــی خــۆشەویستی) مــن‌ نی‌یە ، وەك (کــاکەی فەللاح) ئەڵێ ··· ! جا بۆئەوەی چاکتر لەمشیعرە تێ‌بگەیت ، تکایە بڕوانە (پێشەکی ئەمدیوانە) ·

* * *

ئــەمدڵەی وەك بت‌پەرستێ ڕووئەکاتە چــاوەکەت
نوێژئەکا بــۆ : تیشکی چاووزولفە تێك‌ئالاوەکەت
گەرچی ئەیشێلی بەزەبری قــۆندەرەو پێــلاوەکەت
قــەت بــەدڵرەق باست‌ناکەم ، نایزڕێنم : ناوەکەت
چــونکە ئەیزانم تــەلاری یــارە خــواپێداوەکەت
مەستی‌کردووی ، بــۆیەنابینێ‌لەعاستم ، چاوەکەت

* * *

بــاخەوان بــۆ ئــەومــەبەستە گــوڵ‌ئەلاوێنێتەوە :
بــۆ ئــەوەی گــەورەی‌بکاو بــۆ پارە بیگۆڕێتــەوە
بیفرۆشێ بــەوکەســەی خــەڵقی ئــەڕوتێنێتەوە !
بــۆئەوەی مێزی‌شــەرابی ، پێ‌بــڕازێنێتەوە ···
کچ لەلای‌ئێمەش گوڵێکە ، بۆیەپەروەردەی‌ئەکەن(۲)
تــا بڕازێنێتەوە : مێزی‌شــەرابی دەوڵــەمەن ··!

* * *

ڕەنگە لاتوابێ کەگوایا : یــارەکەت مــارەت‌ئەکا
یــا بەکەیبانووی تــەلاری بەرزی ئــەمشارەت‌ئەکا

---

(۱) بڕوانە چاپی یەکەمی (ڕازی تەنیایی ــ ۱۹۵۷ ــ ل۲٦) ·

(۲) لەچاپی یەکەمدا نووسراوە (کچ‌لەلای ئێمە) ·

ئەمخەیاڵەت خاوە ، تووشی : داوی ئەومارەت ئەکا
چــونکە وەك گورگێکە مەیلی ئــەو لەشولارەت ئەکا
ئــەو بەتەنیا بۆ گوڵی سەرمێزی بادەی[1] تۆی ئەوێ
هەر کەجارێ بۆنی کردی ، جا گوڵێکی نوێی ئەوێ !

★ ★ ★

ئــەو ، گوڵی بــۆ : مێزی بادەو پۆکەرویاری ئەوێ
واتــە : تــۆی بــۆ تێپەڕینی کاتی بێــزاری ئەوێ
مــن ، گــوڵم بــۆ : تۆوی باخی ژینودڵداری ئەوێ
یانی من ، تــۆم بۆ : ئەوینی عومری یەکجاری ئەوێ
تــۆم ئەوێ وەك گــوڵ لــەباخی ماڵی مندا هەڵبدەی
نەك گوڵی سەرمێزی تێمڕۆییتو پێخوستی سبەی !

★ ★ ★

من ، ئەوینم هێنی عومرەو ، هی حەوی شەوگار نی یە
وەك خــەوی خــاوەن تــەلارو خــاوەنی دینار نی یە
هــەربوەو هەرگیز ئــەمێنێ ، هێنی جارو بار نی یە
ئــاوی لێلی ــویرەشێوی - چــەشنی هی ڕووبار نی یە
جــا ئیتر مــن وافسەی حــۆم پێ دــەیاندی ، بێ درۆ
حەزئەدەی هەروەت پەپوولە ڕووبەبا سر دەو بــڕۆ !

لەساڵی ١٩٥٠دا ووتراوەو
لەساڵی ١٩٨٣دا تەواوکراوە

---

(٣) بادە : شەراب ، مەی •

## ( تەپلی بەتاڵ )

ئەم‌شیعرە کە لەساڵی ١٩٥١دا ووتراوە ، بەسەرهاتی کابرایەکی ڕوخاوە کە لەسەردەمی (پاشایەتیدا) ، ڕوونەکاتە کۆشکێکو لەوێ : ڕوخانی خۆی مۆرئەکاتو دوای‌ئەوە بەرزی‌ئەکەنەوەو ئەبێت بەخاوەن پایەیەکی بەرز ... ، بەڵام (کاکەی فەللاح) تەواونەکردنی ئەم‌شیعرە بەهەڵ‌ئەزانێ ، بۆئەوەی ئەم‌شیعرە بەئارەزووی خۆی لێك‌بداتەوە .. (بروانە پێشەکی ئەم‌دیوانە) .

★ ★ ★

(وەمزانی : کەناموس‌وحەیا نرخی کوڕانە[1]
ڕاستگۆیی ووڵات پەروەری ، ئەنجامی‌ژیانە
نەمزانی بڕاکەم ، هەموو ئەم ناوەزلانە
وەك تەپلی‌بەتاڵ ، گەرچی زل‌وگەورەیە ، دەنگیان
دەسکردی‌خەیاڵن ، لەژیانا : نی‌یە ڕەنگیان !)

★ ★ ★

(نەمزانی ئەتیکێتی سەدەی‌تازە ، ڕیایە !
ئادابی‌لەلایە ئەوی‌وەك‌لوتی‌وەهایە
فیزی ئەمو ئەو هەڵئەپەڕێنێ بەسەنایە
کێ‌باوی‌هەبوو ـ نۆکەرە ئەو ، گوێ‌ئەلەقێنێ
مەیمونە ، تەشی‌ڕێسە ، بەدڵ پیاهەڵئەخوێنێ !)

★ ★ ★

بەم‌جۆرە ئەڕۆیشتو لەبەرخۆیەوە ئەیووت :
بڕوا کە نەکەیت، یاکەنەبی ئێستەکەدەمکوت

---

(١) (کاکەی فەللاح)...(کوڕانە)ی کردووە بە(گرانە) ! ، لەوەش سەیرتر ئەوەیە ، لەپەراوێزیشدا ئەڵێت : «لەچاپدا بەهەلە (کوڕانە) نووسراوە ئەگینا (گرانە)یە..!» (کاروانی‌شیعر ـ ل١٤٦ ـ پەراوێزی ٨) .

فەرمو ئەوەگەل : چۆنی ئەلێم ، وایەکوتومت
گەورەی کە لەبەر پارە تەشی ڕستنە پیشەی
بچکۆلەکەشی نۆکەری یە ، کاری هەمیشەی !)

★ ★ ★

(چەندسالە، لەڕێی ئەم گەلەدا، منکەئەسووتێم
کەس نرخی نەزانیم و هەتا تێنەگەیی لێم ... !
ساشەرتە کەمیللەت ئەمەبێ ، بیخەمەژێرپێم ..
هەرچەندە بەسەرزاری ئەبێ : گەلمەبەسم بێ
بۆشوێنەوونی ، بەرزیی ئەو : گورزی دەسم بێ[2]!)

★ ★ ★

ئاوا بەرق و کینەوە هەنگاوی ئەنا بۆی
پیلانی ئەکێشا بەخەیاڵ و خەوی بێ شۆی[3]
تاگەیی یە تەلارێك و کەمێ هاتەوەسەرخۆی
وەك دوودڵی یەك ، قاچی ببەستێتەوە تاوێ
وەستاو و ، لەپاشا ، چووەژوورێ بەشەقاوێ

★ ★ ★

لەوڕۆژەوە هەرچی کەئەزانی و نەئەزانی
لەو کۆشکە هەڵی ڕشت و فرۆشتی بەنیهانی
کۆتایی بەژینی لەوەپێشی ، بەوەهانی !

(٢) ئەو بەیتانەی لەنێوان دووکەوانەدان ، قسەی کابرای ڕووخاوە کەئەیڕواو لەبەرخۆیەوە ئەوقسانەئەکات و قسەکان لێرەدا تەواوئەبێت .

(٣) بێ شۆ : بێ ئەندازە ، لەئەندازەبەدەر ، بڕوانە (دیوانی مەولەوی ـ لێکدانەوەی مەلاعبدالکریمی مدرس ـ بەغدا ـ ١٩٦١ ـ ل٣٢) .

لەوساوە قەلەمبازی ئەدا : پایە بە پایە !
بۆ هەلمەتەکاسەی گەلەکەی ، بووبووەسایە[٤]

★ ★ ★

ئینجا کەگەیی ئەو بەپنەو پایەیی ئەمرۆی[٥]
کۆبوونەوەلێی : پایەپەرستانی وەکوخۆی
تاکو بەتەشیڕستنو بادانی درۆ بۆی
سەودا لە پەنایا بکەنو (جێ) بفرۆشن
پاروو بگلێنن بەشەوو بادە بنۆشن

★ ★ ★

شەو مێزی‌شەرابی کەئەڕازایەوە بۆکۆڕ
ڕووناکی ئەبەخشی لەشەوا ، ویسکیی‌ی‌سەرمۆر !
جا پێكو سەری گەرمو قسەو بابەتی‌سەدجۆر
هەر پەخشی ستاییشی بوو بە سەر کاکی بەڕێزا
هەر گوڵ‌ئەکرا ، جا ، بەیەخەی خاوەنی‌مێزا !

★ ★ ★

تەنیا کەئەبوو ، یا خەفەتێ کاری‌ئەکردتێی
ئەیدی کەقسەی هاودەمەکەی دێتەوەبەر گوێی

---

(٤) سایە : سێبەر ، هەلمەتەکاسە : مرۆڤی چاوچنۆکی خۆتێ‌هەلقورتێنو بێ‌چاوورِوو • بڕوانە (فەرهەنگی خال ـ ۳ ـ ٤۲۰ ـ سلێمانی ۱۹۷٤ لەناوەوە ۱۹۷٦ ـ لەبەرگی فەرهەنگەکە نووسراوە) •

(٥) پایەیی ئەمرۆی : مەبەست سالی (۱۹٥۱)ە کەشیعرەکەی تێداووتراوە ، چونکە باسی کابرایەکی ڕووخاوە لەسەردەمی پاشایەتیدا •

بەمشێوەیە ، ئەیخوێنلەوە ، ئەونامەیە بۆخۆی[٦] :

(فەرموتە : ئەوەی خزمەتی ژێردەستی مەبەستبێ
پێویستە وەکوئێوە : مەزنبێتو بەدەستبێ ١٠٠!)

★ ★ ★

(پاکانەئەکەیت بۆ: هەوەسی نەوسنوبرسیت؟!
گـوایا کەلەبەرخزمەتیگەل ، عاشقیکورسیت ؟
کـورسیتکەهەبێ ، دادیگـەلی لێوەئەپرسیت ؟
قوربان ! بەچڕەنگ پێتئەکرێ : خزمەتیکونجێ
تاسودی لەگەڵ سودیسەری گەورە ، نەگونجێ ؟)

★ ★ ★

(خـۆگەر بیەوێ ئـەوسەرە ، پیلانێ بتاشێ
یابۆ گەلەکەت ، سازیبکا : کورەوو ئاشـێ
ئەیبینی کەلەم دامەیەدا ، ئـەتکەنە : داشێ !
ئەوسامەزنیت ، دەرئەکەوێ ، خـەونوخـەیالە
ئەو گەورەییەی ئێوە وەکو : تـەپلی بەتالە[٧] !)

★ ★ ★

هـەرچیووتبوو هاودەمەکەی ، گشتیوەهابوو
پیـلانوگـەلو ڕۆڵەیی گەل ، ئـاگرو کابوو

---

٦) ئەوبەیتانەی دوای ئەمدێرە خراونەتە ناو دووکەوانەوە ، نـامەی هـاودەمی کابـرای ڕووخـاوە ، کـە بۆکابـرای ڕووخـاوی نـاردووەو ، بەقسەکاندا دەرئەکەوێ کەنامەی هاودەمەکەی لـەوەڵامی نامەیەکی کابـرای ڕووخـاودا نووســراوە .

(٧) لێرەدا : نامەی هاودەمەکەی تەواوئەبێت .

بـۆسودیکەسانێ ، ملیچـەندرۆنە شکابوو !
لـەم نەقشەیەدا ، کـاکیمەزن ، پیادەییشابوو [٨]
لافیمـەزنیو گـەورەییئەو ، هـەروەکوبابوو !

★ ★ ★

ئەوسا قسەکەی هاتەوەگوێ ، زۆربـەزولالی
(تۆ دەنگیدەهۆلێکی ، وەیا : تەپلیبەتالی٠٠!)

لەسالی ١٩٥١دا ووتـراوەو
لەسالی ١٩٨٣دا تەواوکراوە

---

(٨) پیادەی (شـا) لەیاری (شـەترنج)دا ، هیچ دەسـەلاتێکینیە ، هەرنەبێ سنگ بنێ بۆپێشەوە ٠

## (چـاوەڕوانی بێهوودە)

هەموو ڕۆژێ لەبەرسەیری بتی ئەو بەژنو بالآیە
لەسەرڕێدا ئەوەستمەن ، هەتاکو ئاوی پێمدایە !

بـەدووچـاوێ کەشەوقی چاوەڕوانی ئەیترۆکێنێ
بەدووچاوێ کەسرپی قوونی لاوێتی ، ئەدرکێنێ

سەرنجی ڕێ ئەدەم ، ڕێگا ، هەموو شێوەی ئەوی تیایە
وەکودنیا لەناوجوانی ئەواتوابێتەوە ، ... وایە

شنەی با، باسی جوانی ی ئەو، بەگوێی مندا ئەچرپێنێ
هەموو دەرکەوتنی شـۆخێ ، دلی من دائەخورپێنێ

بەلام خورپەی تەواوی دڵ لەگەڵ هەنگاوی ئەودایە
کەسەرتاپا لەئاوازی بەهەشتی خواوە .. پەیدایە

بەلێ ! کاتێ «کەئەودەرکەوت ، ئیترمن بێ سەروشوێنم»
بەتیشکی خۆری جوانی ی ئەو، بەجارێ قولپ ئەدا خوێنم

وەکوچۆن نەونەمامێ ، گەردەلوول ئەیبات و ئەیهێنێ
لـەشم موچرکی دلداری ، وەهاناخی ئەبزوێنێ !

* * *

ئەگەرچی وەك خەیاڵیمن عەبادەوری لەشیداوە[1]
لەئەنـدامو لەشـوولاری بڵندوڕێکی ... ئاڵاوە

بـەڵام کاتێ کەبا چمکیعەباکەی لائەدا ، تـاوێ
ئەڕێژێ پووزیناپابی ،لەسیحریخوایی ، لافاوێ

سلێمانی/ ۱۹۵۱

---

(۱) ئاشکرایە کە لەمبەیتەوە (کۆپلە)یەکی تازە دەستپێئەکات بەڵام کاتی خۆی پێمتەواونەکرا ..... .

## ( ڕازی تـەنیـایی )

ئەمشیعرە هەرچەندە لەساڵی ١٩٥١دا ووتراوە ، بـەڵام شێوەنێکە ، یـان ئاوڕدانەوەیەکە لەقـۆناخێکی لەوەپێشـتر ٠٠ واتـە لـەمڕووەوە ، تـاڕاددەیەك لە(شانزە ساڵ چاوەڕوانی) ئەچێت، وەکو لەونامیلکەیەدا، باسی ئەکەم کەئەکەوێتە دوای ئەم دیوانە ٠

ئەحمەد هەردی

★ ★ ★

ژیانو ئـەرکی ناخۆشیی : پـەپولەی ئارەزوی کوشتم
شـەرابی جامی دڵـداری ، لـە تافی لاوییـا ، ڕشـتم !
تـەمی ڕۆژانی پـڕمەینەت ، وەهـا تـاریكو چڵکن بوو
نیگاری خۆشـەویستی دڵ ، پـەری ئاسایی ، تیاون بوو !
شـەوی تەنیایی ، ڕووناکی چـرای ئـاواتی ، خنکـانم
دەسـی نـاکامی ، ئـاوازی دەروونی کـەیلی ، تاسـانم
ئـەوا ئێسـتا لـەگەڵ زامی ،

دەروونـی پـڕلـەنـاکـامی
ئـەپێوم چـۆڵی : سـەرسامی

★ ★ ★

لـەتەنیایی شـەوی ژینا ، ئـەنێم هـەنگاوی کوێرانە !
نی یـە دەسـتێ ، دەرمبێنێ لـەناو ئـەم گـۆڕە وێـرانە
نی یە جـوانێ ، سەری کاسم ، بنێمە سـەر دڵی نـەرمی !
کـە هیلاکی لەشم دەرکا ، خـەوی سـەر باوەشی گەرمی
ئـەگێرم چـاوی بێ تینـم ، بـە تاریکی شەوا ، سەرسام
نی یە پرشنگی دووچاوێ ، کەڕووناکی بکا ، ڕێگـام ٠٠ !

بەفەیری باڵی غەمناکی ،
شەوی پڕ ترس و سامناکی ،
نی یە یەک تۆزە ڕووناکی !
* * *
نی یە تەنیا پەریزادێ ، کە باڵم پێوەنێ ، نازی
کە بەهرەی سیس و ژاکاوم ، ببوژێنێتەوە ، ڕازی
تەریقەی ئەو ، تەمی ئەم یەئسە ڕامالێ لەسەر چاوم
وەکو لایلایە ژیری کا ، دڵی منداڵی گریاوم
بەڵێ گوێ هەڵئەخەم بێجگە لە خورپەی سستولێدانی !
دڵی پەستم ، کە نووزەی دێ بەعاستەم ڕازی پەنهانی
نی یە هەردەنگی هیچ نایێ ،
لە هیچ شوێنێ لە هیچ لایێ
شەقەی باڵێ شنەی بایێ ..!

سلێمانی/ ١٩٥١

## ( صَلَواتُ المحبْ )[1]

مُنـذُ انْ اشـرَقـتِ في دُنيـا الغَـرامْ
تَسـكُبينَ السـحرَ في جَفنِ الوُجـودْ
بِـكِ كالنَشـوانِ مِنْ خَمـرِ الهُيـامْ
أنطِقُ القيثـارَ مِـنْ لَحـنِ الخُلـودْ

★ ★ ★

يـا مِثـالَ الفَنْ ! يـا طَيْفَ الالـهْ !
في حَنـايـا القَلـبِ قلبـي المَـعبَـدِ
بَسمَـةٌ تَـرنـو عَلى تِلكَ الشـفاهْ
تَغمُرُ الدُنيا : بِنورٍ سَرمَدِيٍّ ٠٠٠!

★ ★ ★

بَسـمَـةٌ تـوحي لأذهـانِ الـزُهـورْ
سِـرَّ ذَيّـاكَ الغَـديـرِ النـاعِـسِ
تُنعِشُ الآمـالَ ، تَشـوى بِـالحبُورْ
في فـؤادي المُـسـتَهـامِ اليـائِـسِ ٠

★ ★ ★

فابسُمي كَـالزَهرِ في وَجـهِ الصَباحْ
اوْ كَـآمـالـي الَّتـي لاتَـنتَهِي

---

(١) لەکاتی خۆیدا ، خالید سەعیدی هونەرمەند ، ئەمشیعرەی لەگۆڤاری «الهاتفەی (نەجەفی)دا بـلاوکردەوە ، لەگـەل سەرپۆتێکی ڕۆمانسیيانەی ژیانیمندا ، داخەکەم ژمارەی گۆڤارەکەو سالی دەرچونیم لەبیرنەماوە ، هۆی دانانی ئـەم شیعرە لەپێشەکی ئەمدیوانەدا باسکراوە ، تکایە سەرنجیبدە ٠

ئەحمەد هەردی

وآسكُري العُشّاقَ بالخَمْرِ المُباحْ
مِنْ ثَنايا ذلِكَ الثَّغْرِ الشَّهِي

★ ★ ★

ثَغْرُكِ السّابِحُ في مَوْجِ السَّنا
فاضَ مِنْ وَجْهٍ سَماوِيٍّ وَديعْ
دافِئٍ كالشَّوقِ في جَفْنِ المُنى
رائِعٍ كالسِحْرِ .. كالفَنِّ الرَفيعْ

★ ★ ★

وَجْهُكِ .. أوّاهُ .. ماجَدْوى الكَلامْ ؟
في جَمالٍ .. لَجٍّ في .. أسرارِهِ
إنَّ سِرَّ الحُسْنِ في ذاكَ القَوامْ
تَعْجِزُ الأقلامُ عَنْ إظهارِهِ

★ ★ ★

فانظُري قَدْ ضاعَ هذا العابِدُ
في الدَّياجي وَحدَهُ صِنْوَ السَّقامْ
باتَ يَكْفيهِ شُعاعٌ واحِدٌ
مِنْ سَنا عَيْنَيْكِ في هذا الظَّلامْ

بغداد/ ١٩٥١

## (تۆبالی خۆت بە ئەستۆی خۆتە)[1]

بەدەستی خـۆت ، کەجـامت خستە سەرلێوت غـەشیمانە
ئەگەر زەهریشی تێدابوو ، گوناهی خۆتە ، بیزانە ...

هـەتـە یاخود گوناهت کرد ، لەکـاتێکا کـە بێ هـۆشی
سـزاو تـاڵاوی هەرچی بێ ، ئـەبێ وەك بادە ، بینۆشی

ئەگـەر پیاویتو ئەیـزانی ، کـەوا ئـۆبالی کـردارت
لە ئەسـتۆی وردی خۆتایە ، ئیتر بێ سـوودە هاوارت !

( ١٩٥٣ )

---

(١) ئەم شیعرە ، سەرەتای چیرۆکێکە ، کەداخەکەم کاتی خـۆی تـەواونەکراوەو ، ئەو سێ بەیتەی لێرەدا نووسراوە ، قسەی قارەمانی چـیرۆکەکەیە ، کـەدوای ئەم قسانە خۆی ئەکوژێ ! داخـەکەم تەواونەکردنی ئەمیشـی ، بوو بەهـۆی ئەوەی : گەلێك قسەی ناڕەوای دوابخرێ ! و هەرکەسێك بەباری دڵی خۆیدا لێکی بداتەوە ! بۆ ئەوەی چاکتر لەم چیرۆکە بگەیت ، تکایە بـڕوانە پێشەکی ئەم دیوانە ! .

## (خەرمانە ۰۰۰![1])

چسرپێکت لەناودڵدا ، حەشارداوە بەپەنهانی ؟
کەچاوت چەشنی ئاوێنە وەهابێ پەردە درکانی ۰۰۰
ئەزانم دڵ هەیە ، وەکمس ، کەژەنگ ئەدێنێ بەئاسانی
دڵی تۆ زێڕی تێزابە لەکوێوە ژەنگی هەڵهانی ؟
ئەمانە گەرچی تێ ناگەم ، بەڵام پێویستە بیزانی[2] :
هەتا ماوم لەدنیادا ، فریشتەی باخی ئاواتم
بەدڵ هەرچەشنی خەرمانە ، لەدەوری مانگی گۆناتم ۰۰ !

(١٩٥٣)

---

(١) ئەمشیعرە لەچاپی یەکەمدا ناوی (منوتو)یە (ڕازی تەنیایی ١٩٥٧ ، ل٢٨)۰
(٢) ئەمدێڕە لەچاپی یەکەمدا لەبیرچووە ۰

## (پەیامی یار[1])

لەیارەوە :
لەشۆخ و شەنگی یارەوە ،
لەرازی ... پڕنیهانی‌یا ،
لەتەك شنەی‌بەیانی‌یا ،
پەیام لەیاری جوانەوە ،
گەیشتەلام ..

* * *

بەرامەکەی ،
گولاوی باخی نامەکەی ،
کەئاوی زیندەگانی‌یە ... ،
شەرابی کامەرانی‌یە ... ،
گوڵی‌هیوای ژیانەوە ... ،
گوڵی هیوام ...

* * *

چ‌نامەیێ ؟
چ‌پەنجەیێ چ‌خامەیێ ؟
ئەوەندە دڵ‌ئەکاتەوە ؟ !
خەفەت لەبیر ئەباتەوە ،
ئەخاتە ناخی گیانەوە :
تەزوی بەتام ... ؟ !

سلێمانی/١٩٥٨

---

(١) ئەم‌شیعرە لەچاپی‌یەکەمدانی‌یە، چونکە دوای‌دەرچوونی چاپی‌یەکەم، دانراوە.

# بۆ سەرکێڵی گڵکۆی ئازیزان

پاشکۆی ـ یان بەشی دووەمی ڕازی تەنیایی

# ( بۆسەرکێلی گلکۆی ئازیزان )

## «پێشـەکـی»

کاتێك کـە(ڕازی تەنیایی) بـۆ یەکەمجار ، لەچاپدرا ، من تەنیا دوو(چـوارینم) ، بەبۆنەی مردنی دوولاوی جوانەمەرگەوە دانابوو ، کـە هەردووکیان لەچاپی یەکەمدا نووسراون • بەڵام دوای دەرچوونی (ڕازی تـەنیایی) ، ناچار بووم‌تکای هـەندێك برادەرو ناسیاوی بـەڕێز بگـرم‌و ، هـەندێك چـوارینی تـری لـەوبابەتە(١) ، دابنێم ، جـا ، لـەبەرئەوە ، وام بـەچاك‌زانی ، هەڵبژاردەیەکیان بخەمە دوای دیوانەکەوەو لـەشیعرەکانی تـری جیابکەمەوەو ناوی‌بنێم : (بـۆ ـەرکێلی : گلکـۆی ئـازیزان) ، چونکە هەریەکێکیان ، بـەومەبەستە دانراوە : کـەلەسەر کێلی ، ئەوجۆرە کەسانە بنووسرێت •

شایانی‌باسە ئـەو چوارینانەی بـۆ ئەومەبەستە دانـراون ، کـەلێك لەوەزۆرترن کەلێرەدا نووسـراون ، بگـرە لـەوانەیە : سێ‌ئەوەندەو چوارئەوەندەی ئەم‌چوارینانەی ئێـرەبن ، بـەڵام هیچیانم لەبیرنەماوەو لای‌خۆشم نەنووسراونەتەوەو وەکوبیرم‌بێت، هیچیشیانم لەوپلەیەدا نەدیوە کە سۆراخێکیان‌بکەم ، تاکو لێرەدا بینـووســەوە •

بەم‌بۆنەیەوە ، پێویستە بلێم : من هیچ‌شتێکم ئەوەندەی‌ئەوە پێ‌گـران‌نی‌یە ، کـە لەسـەر داخـوازی خـەڵك شـیعردانێم ،

بـەتایبەتی ئـەوشیعرانەی لەسەرکێلی مـردوان ئەنووسـرێن ،
بـەڵام لـەگەڵ ڕوولێنـانی دۆستو ئاشـنایاندا ئـەڵێی‌چی ؟!
لـەناو ئەوشیعرە کـەمانەدا کـە لێم‌وون‌بوون ، تـەنیا داخ بـۆ
(شیوەن)ەکەی (بێکە-ی) شـاعیر ئەخـۆم ، کـەبۆ یادکردنەوەی
مامۆسـتای ناوبـراو دامنـابوو لـەکۆبوونەوەیەکی سـینەمای
(سیروان)دا لەسلێمانی خـوێندمەوە ، داخەکەم لـەگەڵ هـەموو
هەوڵو تەقەللایەکدا بۆم نەدۆزرایەوە · لەکۆتاییدا هیوام‌وایە
ئەم چەندچوارینە هەڵبژاردەیەشتان وەکوئەوانی‌تر بەدڵ‌بێت··

١٩٨٤/٤/٢٢

ئەحمەد هەردی

(١) بۆ (کەمالی جەلالسائیب) ووتراوە، کە لە ١٩٣٨/٧/٢٤دا لەرانیە کوژراوە:

بـای‌ئـەجـەل‌هاتو لـەناکاو ، دەفتەری‌ژینی دڕیـم
تاکودوێنێ خونچەبووم ، ئەمڕۆ بەناهەق ، هەڵوەریم !

وەك‌بـروسـکە نـەونەمـامـێ داڕنێ ، وەختی‌چـرۆ
هاتو گوللەی‌وێڵ[1] لەناکاو[2] ، بێ‌گوناه جەرگی‌بڕیم !
(١٩٣٨)[1]

★ ★ ★

(٢) بەزمان (موحەممەد کەریم)ی هاوڕێمەوە ووتراوە کـە لەسەرەتای لاویـدا ، خۆی‌کوشتووە:

بـرام واتێ‌نـەگەی ئـاخم[1] ، لـەداخی نـائومێدیمە
ئـەگەرچی زامی‌سەرسنگم : نیشانەی جوانەمەرگیمە !
بـەڵام بـۆیە دڵـم‌بەرگوللەدا : زانیم کـەچـی‌تیایـە
دڵـێ‌وێنەی کچی‌تیابێ ، نـەمانی باشـە بۆچیمە[1] ؟ !
(١٩٥٣)

(٣) بـۆ (مـەهتابی شـێخ‌جەلالی شـێخ‌ڕەشید) ووتـراوە کـە لەهەڕەتی لاویدا جوانەمەرگ‌بووە :

کـەڕابوردی بـەئەسپایی ، لەسـەرئەم‌گۆڕە پـێ‌دانێ
کـەمەهتابێکی تێدایـە ، مـەگەرئەوخوایە بیزانـێ !

لەبـاخی خۆشەویستیدا ، گوڵاڵـەی نەوجـەوانی‌بـوو
کەچـی کاتی‌گەڵاڕێزانی‌ئەو ، هێشتا ، بەیـانی‌بوو !
( ١٩٥٩ )

★ ★ ★

(٤) بۆ (نەژادی ڕەمزی‌ئەفەندی) ووتـراوە کـە قوتابی کـۆلیجی پزیشکی‌بووە لەئەستەمول‌و ، لەهەڕەتی لاویدا مردووە :

دەرختی ڕەنجی‌چـەندساڵەم ، کـەمی‌مابوو چرۆدەرکا
کـەمی‌مـابوو بـەری‌بـاخم ، ژیـانم پـڕلەسێبەرکـا

بـەئەوئـاواتە مـن ئەژیام ، لەکونجی دووروولاتێکا
لەپـڕمردن ، تەلاری ژینمی‌ڕوخـان ، لەساتێکا ٠٠ !
١٩٦٩/٣/٦

★ ★ ★

(٥) بـۆ (شێخ ئەحمەدی شێخ‌ڕەزا)ی بەرزنجەیی ووتراوە ، کـە لەنەخۆشخانەی سلێمانی کۆچی‌دوایی‌کردووە :

هەتامابووم ، دەسی‌تاسەم ، نەگەیی‌یە چاکی‌دڵخوازێ !
نەهۆشم مەستی‌بۆنێ‌بوو ، نەگوێچکەم کـەیلی‌ئاوازێ !
کـەمردیشم لـەژوورێکی : نـەخۆشخانـەی سلیمانی
نەدڵسۆزێ لەدەورم‌بوو ، نەکەسـ بەومردنەی زانی !
( ١٩٧٢ )

(٦) بۆ (شێرزادی کاکەجەزا) ووتراوە کە لەکۆلیجی کشتوکال لەهەرەتی‌لاویدا، کۆچی‌کردووە :

هەموو ئـاواتی‌نـاکامم : گـوڵاڵـەی‌لالـەزاری بـوو
شـریتی‌سەرگورشتەی‌من : خـەویکی نەوبەهـاری بوو
هەموویێچانەوەی‌ژینـم ، بـریتی‌بوو : لـەچیرۆکـێ
لەکورتی‌و زووبەسەرچوونا : بزەی‌سەرلێوی‌یاری‌بوو !

١٩٨٠/٣/١٧

(چوارینەکان تەواوبوون)

# پەراوێزەکانی بەشی دووەم
# (چوارینەکان)

(١) لێرەدا مەبەست لەو شیعرانەیە کە لەسەرشێوەی چوارینە (رباعي) دانراون ، نەك لەسەر کێشی چوارینە کە کێشێکی تایبەتی یەو لە (بەحری هەزەج) دەرئەهێنرێ بروانە : (تاريخ الادب ، من الفردوسي الى السعدي ـ للمستشرق ا٠ ج٠ براون ـ ترجمة ـ د٠ ابراهيم امين الشواربي ـ مطبعة السعادة بمصر ـ ١٩٥٤ ـ ص٤٨) ٠

(٢) ئەوی ڕاستی بێت ، گوڵڵەی وێڵ ئەوەیە : کە لەلای لابەلاوە کەسێکی بێ تاوان بکوژێت ٠ هەرچەندە کەمالی جوانەمەرگ زۆر بێ تاوان بوو و گوڵڵەکەش بەتایبەتی ئاراستەی ئەونەکرابوو ، بەڵکو نرابوو بەجێگەی باوکیەوە ، کە بەرێکەوت ئەوی تێدانوستبوو ، بەلام هەرچۆنێ بێت گوڵڵەی وێڵی بێ ناوترێ ، لەگەڵ ئەوەشدا چونکە لەکاتی خۆیدا گوڵڵەی وێڵم بەکارهێناوە نەمویست بیگۆڕم ٠

(٣) ئەوی من بیرم بێت لەسەرەتادا دێرەکە وابوو : (هاتو گوڵڵەی وێڵ لەناکاو) ، بەلام لەدواییدا گۆڕیم بە : (لەخەودا)و لەخوێندنەوەدا هەر ووتوومە : (هاتوگوڵڵەی وێڵ لەخەودا) ، بەلام وادەرئەکەوێت لەکاتی نووسینەوەی شیعرەکەدا گەڕاومەتەوە بۆ دەقی پێشووی ، هەرچەندە (لەخەودا) بەڕاستر ئەزانم ، لەگەڵ ئەوەشدا نەمویست بیگۆڕم ٠

(٤) وەك لەمامۆستایان : كاك (عەلی شەونم)و كاك (نیهال صائب)ی برای (كەمال)م بیستووە لەسەركێل فەبرەكە سالی (١٩٣٧) بەمێژووی كوشتنی دانراوە ، بەلام كاك نیهال ئەلێت : بەپێی نووسینی جەمیل صائب و مستەفا صائبی مامی كارەساتەكە لەسالی ١٩٣٨دا ڕوویداوە ، بەم بۆنەیەوە سوپاسی مامۆستایان : كاك عەلی شەونم و كاك نیهال صائب ئەكەم ٠

(٥) لەچاپی یەكەمدا : (برامواتیمەگە) نووسراوە كەهەلەیەو (برامواتینەگەی) ڕاسترە ٠

(٦) (كاكەی فەللاح) كەباسی ئەم چوارینەیە ئەكات ، وای پیشان ئەدات كەگوایە من : بەزمانی ئەولاوەوە ، شیوەن بۆ خۆم و بەسەرهاتی خۆم ئەكەم !!! و گوایە : دڵ بەرگوللەدان بەڕەوا ئەزانم ، لەبەرئەوەی وێنەی كچی تیایە !! جگەلەوەی بەوبۆنەیەوە ، لیستەیەك تاوان و ناوو ناتۆرەم ، پێوەئەلكێنێ !! ، بڕوانە (كاروانی شیعر - ل١٦٢ ، ١٦٣) ، بێ گومان ئەگەر تەمەن و ڕۆژگار یارمەتیم بدەن ، لەنامیلكەكەدا وەڵامی یەك بەیەكی ئەم قسانە ئەدەمەوە ، بەلام لێرەدا تەنیا شیعری (خەرمانە) كەلەهەمان سالدا وتراوە ئەكەم بەوەڵامێكی سەرەتایی ، بۆقسە ناڕەواكانی و ئەڵێم : كەسێك ئامادەبێت دڵی بداتە بەرگوللە ، لەبەرئەوەی وێنەی كچی تێدایە ، جارێكی تر شیعری وەها ، بۆ هیچ كچێك نالێت ! ٠

ئەحمەد هەردی

١٩٨٤/٤/٢٢

## ئەحمەد هەردی کێیە ؟ !

(١) هەردی ، ناوی (ئەحمەد)ە ، باوکی ناوی (حەسەنبەگ)ە ، کە کوڕی (عەزیزبەگ) ، کوڕی (کەریمبەگزادە) برای (ئەحمەدبەگزادە) کوڕی (محەممەدبەگ)ە .

(٢) لەساڵی ١٩٢٢ز. دا ، لەشاری سلێمانی لەدایکبووەو خوێندنی سەرەتاییشی لەوێ تەواوکردووە ، لەساڵی (١٩٣٨)ەوە لەنووسیندا نازناوی (هەردی) بۆخۆی هەڵبژاردوە ، بەڵام کەسەیریکردوە هەندێکەسی سادە ، نازناوی (هەردی) لەهی خوالێخۆشبووان (محمد توفیق وردی)و (ا. ب. هەوری) جیاناکەنەوە ، زۆرجار هاتوەتەسەرئەوەی کە (هەردی) بگۆڕێ ، بەڵام بۆینەکراوە ، چونکە نازناوی (هەردی) زاڵبوە بەسەر ناوەکەیدا .

(٣) لەساڵی ١٩٤١دا بوە بەمامۆستا لەقوتابخانە سەرەتاییەکاندا .

(٤) لەساڵی ١٩٥٧دا کۆمەڵێك شیعری بەناوی (ڕازی تەنیایی)یەوە چاپکردوە ، کە ئەمەیئێستا چاپی دووەمێتی .

(٥) سەردەمێك لەیەکێتی نووسەرانی کورددا ، لەدەستەی بەڕێوەبەری ناوەندا ئەندامبووەو سەردەمێکیش سەرۆکی لقیسلێمانی بوە .

(٦) لەساڵی (١٩٧٣ ـ ١٩٧٤)دا لەکۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سلێمانیی ـ ـ سەلاحەددینی ئێستادا ـ مامۆستای ڕەخنەی ئەدەبیبووەو لەوڕووەوە گەلێ موحازەرەی داوە کەهێشتا چاپنەکراون .

(٧) لەزۆردەمێکەوە لێکۆڵینەوەیەکی درێژی بەدەستەوەیە دەربارەی کێشی شیعری کلاسیکی کوردی .

(٨) لەساڵی ١٩٨١دا خۆی خانەنشینکردوە .

(٩) وەك مامۆستا (عومەرعارف شێخمەحمود)لەزمان گۆرانیشاعیرەوە لەیگێڕێتەوە ئەڵێ : «مامۆستا گۆران دەربارەی (هەردی) ووتوویەتی : [هەردی قوتابخانەیەکی تایبەتییە لە شیعری کوردیداو شوێندەستی لەهەڵبەستەکانیدا دیارە] » .

(١٠) بۆئەوەی تینوویەتی هەزاران لاوی ڕۆشنبیر بشکێنینو خواستی خوێنەران بەجێبهێنین زۆرمان هەول لەگەڵ مامۆستای شاعیر دا ، تا بەڵێنیدا کەئەم چاپی دووەمەتان پێشکەش بکات .

عمر عبدالرحمن
خاوەنی کتێبخانەی سلێمانی

# سوپاس

(١) بەپەڕی سوپاسی مامۆستای هونەرمەند (جەمال عەبدول) ئەکەم ، کەنەک هەر دووسێجار پێشەکی و دیوانەکەی نووسیوەتەوە ، بەڵکو گەلێ شتی تری وەک تەتەڵەو پوختەکردنی ڕێنووسەو نەخشاندنی بەرگەو کلێشەکانی ئاوەوەشی گرتەئەستۆ ، کەشتێکە هەرگیز بەمن نەئەکرا ، دووبارە سوپاسی ئەکەمەوەو خوا وێنەی زۆرکات •

(٢) هەروەها بەپەڕی سوپاسی بەڕێوەبەرو کارگەرانی چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین ئەکەم بۆئەو هەوڵو تەقەلا بێسنوورەی دایان بۆ چاپکردنو ڕاپەڕاندنی ئەم کتێبە • بەشێوەیەکی ڕێکوپێک • خوا وێنەیان زیادکات •

(٣) هەروەها بەپەڕی سوپاسی مامۆستای چیرۆکنوس کاک (سالح محەممەد ئەمین) ئەکەم کەلەکاتی چاپدا، ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی گرتە ئەستۆی خۆی•

(٤) هەروەکو زۆر سوپاسی خاوەنی کتێبخانەی سلێمانی کاک (عومەر عەبدولرەحمان) ئەکەم کەئەرکی چاپکردنی ئەم کتێبەی خستە سەرشانی ، لەخوا ئەپاڕێمەوە کە وێنەی ئەم جۆرە برایانە زیادکاتو لەشەڕەشەڕی ڕۆژگار بیانپارێزێ •

ئەحمەد هەردی

# نـاوەرۆكی (ڕازی تەنیـایی)

لاپەڕە ناوی بابەتەکان ـ بەشی یەکەم

## لیستەی ڕاستو چەوت

| لاپەرە | دێر | چەوت | ڕاست |
| --- | --- | --- | --- |
| ٧ | ١٢ | سەرچاەی | سەرچاوەی |
| ٧ | ١٥ | جوانی | جوانیی |
| ١٠ | ١٠ | نالەباریو | نالەباری |
| ١١ | ١٩ | (ئەنومر قادر) | (ئەنوەر قادر)(١) |
| ١٦ | ٧ | کە ئەڵێت | ئەوەی کە ئەڵێت |
| ١٩ | ٢٠ | شاعیر بگەین | شاعیر .. بگەین |
| ٢٣ | ١٥ | کەپێی ئەڵێن | کە پێیان ئەڵێن |
| ٢٦ | ٢١ | قسە ڕاو | قسەدوا |
| ٣٢ | ٣ | مان | یان |
| ٣٩ | ١٦ | ل ـ ١٦٤ | ل ـ ١٦٣ |
| ٤٠ | ٥ | ل ـ ١٦٣ | ل ـ ١٦٤ |
| ٤١ | ٣ | بیر نەمابوو | بیرمابوو |
| ٥١ | ١٤ | (دواییت لەبیربێ) | (دواییت لەبیربێ) وە ، |
| ٥٣ | ١ | خونچەی | خونچەکەی |
| ٥٣ | ٥ | چۆڵ هەردێ | چۆڵو هەردێ |
| ٥٩ | ١٠ | جوانی | جوانیی |

**تکـایـە :** ئەم سێ دێڕەی دوایی (لـ٧١) بەم جۆرەیە :ـ

**ئاوی لێلی کوێرەشیوێ ، چەشنی هی ڕووبارنییە ،**

**جائیتر مـن واقسەی خـۆم ، پێگـەیانی ، بێ درۆ**

**حەزئەکەی هەروەك پەپوولە ، ڕوولەئاگرکەو برۆ !**

لەکتێبخانەی نیشتمانی بەغدا
ژمارە (١٥١٧)ی سالی ١٩٨٤ی دراوەتێ

نــرخی (٧٥٠) فلســە

لە ١/١/١٩٨٥ دا چاپی تەواو بووە

لە بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین لە چاپ دراوە